

# زانکۆپرێس

گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە راگەیاندنی زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر دەری دەکات
ژمارە (40) ئاب - 2020

## پلازمای خوێن بۆ نەخۆشانی کۆرۆنای نوێ



■ د. سازان قادر مەولود:
**بەرامبەر ڤایرۆسی کۆرۆنا دەتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین**

■ دەرچوویەکی زانکۆی سەلاحەدین
**لە تەلارسازییدا خەڵات بە دەست دەهێنێ**

■ **ڕەنگەکانی ئابووری**

| No. IRAQ | The name | Citation No. | NO. Kurdistan Region |
|---|---|---|---|
| 1 | University of Baghdad | 39528 | |
| 2 | University of Basra | 37672 | |
| 3 | University of Technology Iraq | 28690 | |
| 4 | Mustansriya University | 18410 | |
| 5 | University of Mosul | 17344 | |
| 6 | University of Sulaimani | 16253 | 1 |
| 7 | University of Anbar | 14409 | |
| 8 | University of Kufa | 11995 | |
| 9 | Salahaddin University- Erbil | 11290 | 2 |
| 10 | University of Duhok | 10030 | 3 |
| 11 | Karbala University | 8721 | |
| 12 | Al Qadisiya University | 8589 | |
| 13 | Diyala University | 7925 | |
| 14 | (3)College of Scince Baghdad University | 5854 | |
| 15 | Al Nahrain University | 5798 | |
| 16 | Hawler Medical University | 4940 | 4 |
| 17 | Middle Technical University | 4798 | |
| 18 | University of Wasit | 3944 | |
| 19 | Northern Technical University | 3666 | |
| 20 | University of Thiqar | 3296 | |
| 21 | University of Zakho | 2583 | 5 |
| 22 | Kirkuk University | 2208 | |
| 23 | Al Furat Al Awsat Technical University | 2041 | |
| 24 | Erbil Technical University | 1926 | 6 |
| 25 | Al Muthanna University | 1882 | |
| 26 | Koya University | 1858 | 7 |
| 27 | Al Esraa University College | 1735 | |
| 28 | Soran University | 1526 | 8 |
| 29 | Tishk International University | 1506 | 9 |
| 30 | Al Qasim Green Technology | 1264 | |

Transparent Ranking: Tenth Edition (**July 2020**), Version 10,1,1

Webometrics , Google Scholar Profiles

# ڕانكی زانكۆی سەلاحەدین لە گوگڵ سكولەر ٢٠٢٠

ڕانكی زانكۆی سه لاحه دین بۆ مانگی حه وتی ٢٠٢٠ له Google scholar citation
بەپێی دوایین ئەبدێتی زانكۆكانی كوردستان و عێراق زانكۆی سەلاحەدین پلەی دووەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی زانكۆكانی هەرێمی كوردستان و پلەی نۆیەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی زانكۆكانی عێراق، ئەمە لەكاتێكدا زانكۆی سەلاحەدین كۆمەڵەی پزیشكی لەخۆ ناگرێ، لەنێو زانكۆكانی كوردستان و عێراقدا.




## ڕانكی زانكۆی سەلاحەدین لە گوگڵ سكولەر

## تەمموزی 2020

خاوەنی ئیمتیاز
**د. جەوهەر فەتاح سەعید**

سەرنووسەر
**ڕەسوڵ عەزیز محەمەد**
r1970bakhtiar@gmail.com

دەستەی نووسەران:
**هونەر كەماڵ**
**سگڤان مستەفا**

پەیامنێر: **سیپان جاف**

بەڕێوەبەری هونەری
**كاوە فاروق**

زانكۆ پرێس

گۆڤارێكی ڕۆشنبیری گشتییە بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندنی زانكۆی سەلاحەددین دەری دەكات ژمارە (40) ئاب ی 2020

www.su.edu.krd

ناونیشان: هەرێمی كوردستان- هەولێر سەرۆكایەتی زانكۆی سەلاحەدین ژمارەی تەلەفون 07504542299




**د. فرسەت رۆژبەیانی**

بەشی مێژوو - کۆلێژی ئاداب


# ئۆپەراسیۆنی ماموت ١٩٤٣ بە شێکی ونی مێژووی هەولێر و کوردستان

ساڵی ١٩٤٢ ئەڵمانیا بەهۆی فراوانی بەرەی شەڕەکانیەوە، زۆر پێویستی بە وزە بوو بۆیە ئاراستەی هێرشکردنی بۆ رووسیا، بەرەو شاری مایکۆب و گرۆزنیٚ و باکۆ گۆڕی. هێرشی برد تا دەست بەسەر بیرە نەوتەکانی ئەو ناوچانەدا بگرێت، لە باکوری ئەفریقاش فەرماندەی ئەڵمانی بەناوبانگ رۆمل تا سنووری میسر رۆیشتبوو، کوردستان دەکەوێتە نێوان ئەم دوو جوگرافیایەوە. لەو سەردەمەدا، گۆتفرید یۆهانس میولەر پرۆژەیەکی ئامادە دەکات بۆ موخابەراتی ئەڵمانی دەربارەی ناردنی چەند کەسێک بۆ کوردستان تاوەکو کورد هانبدەن دژی ئینگلیز و راپەڕین بکەن و دەستبگرن بەسەر بیرەنەوتەکانی کەرکوک وموسڵدا. میولەر خۆی ساڵی ١٩٣٦ سەردانی کوردستانی کردبوو پێشتر و شێخ مەحمودی ناسیبوو هەروەها لەگەڵ شیخ لەتیفدا سەردانی ناوچەی پشدەری کردبوو و ئاغاکانی ئەوناوەی دەناسی، ئەمە وایلێکرد خۆی وەک شارەزا لەکاروباری کورد خۆی بە مخابراتی ئەڵمانی بناسێنێت، ساڵێک دوای هاتنەوەشی کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی «خۆکوتانە ناو کوردستانی داخراو» کتێبەکە کراوە بەکوردی لەدەزگای ژین لەسلێمانی چاپکراوە. ئۆپراسینەکەی میولەر بەناوی شێخ مەحمودەوە بوو بەڵام بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێت، چەند پیتێکیان لیٚ لادا بوو «mahmut=mamumut مامووت». دەبوایە لەم ئۆپراسیۆنە نهێنیەدا کوردێکیان لەگەڵدا بێت چونکە بیٚ کورد نەدەکرا بۆیە لەکەسێک دەگەران، ئەوەبوو گەنجێکیان دۆزۆەوە بەناوی «رەمزی نافع رەشید ئاغا» کە لەبنەماڵەی رەشید ئاغا بوو «کاپتن های لە کتێبی دووساڵ لەکوردستان باسی دەکات وەک بەهێزترین پیاوی هەولێر و دژ بە ئینگلیز». ئەندامانی تری ئۆپراسیۆنە جۆرج کۆنیچنی و هۆفمان ناوێک دەبن کە تەنها لەبەر فارسی زانین بەشداری








دەکەن. ڕەمزی نافع ڕەشید ئاغا ئەندامی حزبی هیوا دەبێت وساڵی ١٩٣٩-١٩٤٠ لەزانکۆی ئەمریکی لەبیروت دەخوێنێت و دوایی دەگەڕێتەوە هەولێر و دەچێت بەمەبەستی خوێندن لەتورکیا دەیەوێت لەڕۆبەرت کۆلێج وەربگیرێت، لەوکاتەدا جاسوسێکی ئەڵمانی پێی دەڵێت بۆ ناچیت لەئەڵمانیا بخوێنیت؟ ئەویش ڕازی دەبێت، ئەو نازانێت کە ئەڵمان بەتەمای چین، لەوێ پێی دەڵێن ئێمە بەتەمای کردەوەیەکی وان بۆ کورد و میولەر پێی دەڵێت من وەعدم لەهیتلەر وەرگرتووە کەدەوڵەتی کوردی دابمەزرێنین «بەڵام ئەمە تەنها بۆ ئەوە بوو کە ڕەمزی ڕازی بێت و نەڵێت نا» لەوماوەیەدا نزیکەی ٦ مانگ خۆیان بۆ کردەوە کە ئامادە دەکەن ڕەمزی ٤ مانگ لەگەڵیان دەبێت، لەوێ جلی کوردی بۆخۆیان دەدوورن و ئاڵایەکی کوردستانیش دروست دەکەن وەک ئەم ئاڵایەی خۆمان بووە ئێستا و پێش ڕۆژێک لە هاتنیان بۆ کوردستان بەرزی دەکەنەوە لەبینایەی وەزارەتی بەرگری ئەلمانی». دوایی بە فرۆکە دێن بۆ ئۆکرانیا و لە دورگەی قرم شەوێک دەمێننەوە و دواتر بەرێدەکەون بۆ کوردستان، کەدەگەنە کوردستان لەجیاتی ئەوەی لەناوچەی پشدەر بەپەرەشووت خۆیان هەڵدەن لەنزیک تل کیف لای موسڵ خۆیان هەڵدەدەن کە ٢٠٠کلم لە ئامانجیان دوورە لەوێوە دەبێت بەپێ بڕۆن بۆ هەولێر. دەگەنە هەولێر و هەموو پۆلیس و سووپای ئینگلیز بەدوایانەوە دەگەڕێن، چونکە پەرەشووت و هەموو سندوقی چەک و پارەو شتوومەکەکانیان کەشف ببوو، ماڵی ڕەمزی ناتوانن داڵدەیان بدەن، دەچن بۆ گوندێکی ماڵی مامی لە بنەسڵاوە و لە ئەشکەوتێک خۆیان حەشار دەدەن و دوایی لەگەڵ قاچاغچیەک ڕێکدەکەون کەبیانبات بۆ تورکیا بەڵام ئەو خەبەریان لێ دەدات «چونکە پارەی پاداشتی حکومەت بۆ ئاشکراکردنیان زۆرتر بووە«. ئەوان لە ١٧ حوزەیرانی ١٩٤٣ هاتنە کوردستان و لە ٢٩ حوزەیرانی ١٩٤٣ دەستگیرکران و بردران بۆ هەولێر و موسڵ و میسر و تا جەنگ تەواو بوو، میولەر و هۆفمان و کۆنێچنی ئازادکران، ڕەمزی حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو و دوایی حوکمەکەی بووە هەتاهەتایی کەمکرایەوەو لە ١٩٤٦ بەهۆی نەخۆشی دەروونیەوە ئازادکرا و لە ١٩٤٩ بە ٣٢ ساڵی کۆچیدواییکرد.



# کتێبخانەی کۆلیژی ئاداب

کتێب و کتێبخانە کۆڵەگەی هەموو کۆمەڵگە و تاکێکە، زۆر لەمێژە گوتوویانە ئەگەر چوویتە هەر ماڵێک کتێبخانەی تیادا بوو، ئەوا تێدەگەی تاکەکانی ئەو ماڵە هزر و بیرکردنەوەیان فراوانە، هەروا لەو کاتەی مرۆڤ بەدوای کتێبدا دەگەڕێت شارستانییەتی مرۆڤایەتی بەرەو پێشچووە و هەردەم لەپێشکەوتندایە، هەموو بوارەکان بەهۆی هزری بیرمەندان و نووسەران و هونەرمەندان و مامۆستایان و قوتابیان هەردەم لەپێشکەوتندا بوونە، لەسەردەمی نوێ زۆرێک لەئێمە هۆگری خوێندنەوە بووینە، بەهۆی ئەو هۆگرییەوە توانیویمانە زیاتر هزر و بیرکردنەوەکانمان فراوانتر بکەین، کاتێک لەنێوەندی شارەکاندا کتێبخانە دانرا، رووخسار و پێشکەوتنی شارەکان وەرچەرخانێکی دیکەی بەخۆیەوە بینی و بەهۆی کتێب خوێندنەوە تواندرا زۆرێک لەلایەنەکانی ژیان بەگوڕتر بێ و جۆش و خرۆش بکەوێتە نێو کۆمەڵگە، بەمەش تواندرا چەندین هەنگاو بەرەو پێش بڕوات، کاتێکیش کە زانکۆکان کرایەوە زیاتر کتێبخانە رۆڵی بەرچاوی بینی بۆ هۆشیارکردنەوە و گەڕان بەدوای سەرچاوەکاندا، بەمەش قوتابی و مامۆستایان توانیان زیاتر ئاگاداری هەموو زانستەکەکان بن، زۆرجاریش دانانی کتێبخانە و دیزاینکردنی بەشێوەیەکی جوان وا لەخوێنەران دەکات زیاتر رووی تێبکەن، لەنێوەندی ئەم بابەتەدا باس لەکتێبخانەی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین دەکەین، کاتێک دەچیتە ژوورەوە جۆش و خرۆشێک لەلایەن قوتابیان دەبینی و لەنێوەندی هۆڵی خوێندنەوەدا دەیان قوتابی خەریکی خوێندنەوە و چەندین قوتابی دیکەش دەیانەوێ کتێب و سەرچاوەکان بخوازن، لێرەوەش ئەوە دەبینی فەرمانبەرانی ئەو کتێبخانەیە بەدڵسۆزی کارەکانیان دەکەن و هەموو ئەو کتێبانە دەخەنە بەردەستی داواکار تا سوود لەسەرچاوەکان وەربگرێ و بتوانێ بەپێی ئەو سەرچاوانە کار و توێژینەوەکانی پێ تەواو بکات، یاخود زانیارییەکی باشتر وەربگرێ.

لەوێدا د.ئازاد عوبێد ساڵح وەک سەرپەرشتیاری کتێبخانە باسی لەوە کرد، کە هەردەم فەرمانبەران و بەڕێوەبەرانی کتێبخانە لەکاردان بۆ دابینکردنی داواکارییەکان تا قوتابی یان مامۆستا سوود لەو کتێبانە وەربگرێ، جەختیشی لەوە کردەوە ئێستا «کتێبخانەی کۆلیژی ئاداب سەرچاوەیەکی زۆری تیادایە، هەموو بوارەکانی زانستی و ئەدەبی دەگەڕێتەوە، هەروا توانیومانە کتێبخانەی هەموو بەشەکانی کۆلیژ لەیەک کتێبخانەدا کۆبکەینەوە»، لەلایەکی دیکەوە باسی لەوە کرد کە «زۆرێک لەقوتابی و مامۆستایان کتێبەکان ناهێننەوە، راستە ناسنامەیەکیان









لێ وەردەگیرێ، بەڵام زۆرجار لەبیریان دەچێ بیهێننەوە، یاخود هەندێک لەو داواکارانە کتێبەکە ناهێننەوە، جگە لەوەش بەشێک لەمامۆستایان زۆر ناڕازین کاتێک داوای ناسنامەیەکیان لێ دەکرێ بۆ بردنی کتێب».

ئەوەی شیاوی باسە کتێبخانەی کۆلیژی ئاداب زۆر بەجوانی دیزاینکراوە و پۆلینکردنەکەشی بەپێی ستانداردی کتێبخانە و تواندراوە هەر بوارێکی زانستی بەتەنیا پۆلین بکرێ، بەڵام سەرپەشتیاری کتێبخانەکە جەختی لەوەش کردەوە کتێبخانەی کۆلیژی ئاداب «شوێنەکەی بچووکە و لەساڵی ٢٠٠٧ هیچ کتێبێکی نوێ بۆ کتێبخانە نەکڕدراوە، تەنیاش بەهۆی دیاری نووسەران و توێژەران کتێبی نوێ دێتە نێو کتێبخانە، لەگەڵ ئەوەی ئەکادیمیای کوردی هاوکاری کتێبخانەکە دەکات، هەرچی بڵاوکراوەیان هەیە پێشکەشی کتێبخانەی دەکەن، هەروا لەلایەن هەڵگرانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا نامەکانیان پێشکەش بە کتێبخانە ناکرێ، پێویستە دانەیەک لەنامەکانی ماستەر و دکتۆرا پێشکەش بەکتێبخانە بکرێ، لەلایەکی دیکەوە هیچ گۆڤار و رۆژنامەیەک لەلایەن دەزگاکانەوە پێشکەش بە کتێبخانە ناکرێ، هەموو ئەمانەش دەبێتە بەشێک لەدەوڵەمەند نەبوونی کتێبخانەکە، لەگەڵ ئەوەی کتێبخانەی کۆلیژی ئاداب سەرچاوەی زۆرە، بەڵام پێویستیشە لەلایەن دەزگاکانەوە کتێب و بڵاوکراوە و رۆژنامە و گۆڤارەکان پێشکەش بەکتێبخانەکە بکرێ، هەروا پێویستە لەلایەن و کۆلیژ و سەرۆکایەتی زانکۆوە چەندین سەرچاوە بکڕدرێ بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی کتێبخانە».





**د.عەبدوڵڵا رەحمان**

بەشی زمانی کوردی ـ کۆلێژی پەروەردەی مەخمور

# کۆمەڵناسیی شیعر

شیعر وەکو ژانرێک مێژوویەکی دێرینی هەیەو لەکۆنەوە مرۆڤ هەست و بیروبۆچوونەکانی لەمەڕ دیاردە و رەگەزەکانی سروشت و ژیان بەشیعر دەربڕیوە و هەمیشە بەهۆی شیعرەوە جوانییەکانی ژیانی چڕیوەو چێژی لێ بینیوە، لەمەشدا شیعر کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر مرۆڤدا هەبووە چ بەهۆی ئەو زمانە بالایەی کە بەکاریهێناوە و چ بەهۆی ئەو ئیقاع و مۆسیقایەی کە چێژی بە وەرگرەکانی گەیاندووە. لێرەشدا مرۆڤ خۆیەتی خۆی دۆزیوەتەوە، چونکە شیعر وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی چێژێکی رۆحی بە مرۆڤ دەبەخشێ و جیهانێکی بێ سنووری لەبەردەم والا دەکات، کە لەرێگای دۆزینەوەی خودی خۆی، خودیەتی سەرجەم مرۆڤایەتیش ببینێت، بەم پێیەش ئەو ئەزموونەی کە شیعر هەڵیگرتووە، ئەزموونی سەرتاسەری مرۆڤایەتییە. بۆیە شیعر تەنیا لاسایی کردنەوە ژیان و خۆشاردنەوە لە پەراوێزەکانیدا نییە، بەڵکو بەشداریکردنێکی چالاکانە وخۆبەخشانەیە بۆ بنیادنانی ئەو ژیانە و هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری و نوێبوونەوەیەتی(د.عبدالقادر الرباعی، ١٩٨٠، ص٥٠). بەو واتایەی شیعر لەخودی خۆیەوە بەرەو واقیعی کۆمەڵ هەنگاو دەنێت و هەوڵ دەدات بابەتەکانی بکاتە کەرستەی بەرهەمەکەی و لە ئەزموونێکی تاکی هەست ونەستدا چارەسەرییان بۆ بدۆزێتەوە. بەیەکەوەگەیشتنی خود و بابەت لە چوارچێوە کۆمەلایەتییەکەدا بەرجەستە دەبێت، لەبەر ئەوەی (( هەمیشە لە ناخی کێشە خودییەکانەوە کێشەیەکی بابەتی هەیە، هەروەکو چۆن لە ناخی کێشە کۆمەلایەتییەکان وەکو شوێنێکە کە کێشەکانی تاک بەیەک دەگەیەنێت، ئەزموونی ئەدەبی کێشەیەکی کاتییە بۆ خودی نووسەر، بەلام ناتوانێت بگاتە لوتکەو خۆی بسەلمێنێ، ئەگەر تێکەڵی کۆمەڵ نەبێت و لەو خودییە رزگاری نابێت، تاوەکو لە واقیعێکی تایبەتەوە بەرەو واقیعێکی گشتی هەنگاو نەنێت)) (د.رجاء عید، ١٩٧٤: ص٨٤).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شیعر لەبابەتێکی خودییەوە بەرەو واقیعێکی بەرجەستەی ژیانی مرۆڤ هەنگاو دەنێت



و تەنیاش بەلاسایی کردنەوەی ژیان واز ناهێنێت، بەڵکو ئیرادەیەکی بەهێزی بۆ گۆڕانکاری و نوێبوونەوەی تێدا دەچێنێت کە بەردەوامی بە ژیانی مرۆڤ دەدات، چونکە مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ گۆشەنیگایەکی ڕووناک دەژی کە لە واقیعی ژیاندا بەدی ناکات، کاتێکیش شیعر دێت ئەو گۆشەنیگایە زیندوو دەکاتەوە و لە جیهانی غەیبەوە بۆ جیهانی شیمانەکردن دەیگوازێتەوە، ئەوا خۆراکێکی ڕۆحی پێشکەش بە مرۆڤ دەکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شیعر لە بەها و ئەزموونە مرۆڤایەتییەکاندا ڕەگاژۆ بووە و هەمیشە ئەوەی خواستووە کە مرۆڤ لە ژیانێکی جوانیدا بژیت. ئەم بۆچوونانە پەیوەندییەکانی نێوان شیعر و کێشە کۆمەڵایەتییەکان شرۆڤە دەکەن، لەو ڕوانگەیەی کە مادام شیعر بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ژیاندا کارلێکدەکات، ئەوا کارلێکردنی لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتییەکانیش شتێکی مسۆگەرە، بۆیە شیعر بە دەزگایەکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت کە زمان ئامرازەیەکەیەتی کە ئەویش لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵگەیە، شێوازە ئاساییەکان و لایەنە کۆمەڵایەتییەکان بەشێک لە ئەدگارەکانی پێکدەهێنن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستی بوون بە شیعر، لەیەککاتدا پێویستییەکی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییە (د.عبدالقادر الرباعي، ١٩٨٠، ص٥٠)،. بۆیە شیعر کاریگەری و کارتێکراوی خۆی هەیە لەسەر خودی شاعیریش کە وەکو تاکێک لەناو کۆمەڵگەدا ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ دەکات، شاعیر هەمیشە لە ساتەوەختێکی مێژووییدا جیهانی دەرەوەی هاوسەنگ دەکات لەگەڵ جیهانی ناوەخۆیدا بۆ ئەوەی ئەرکەکانی لەمەڕ کۆمەڵگە بەجێ بهێنێت. بۆیە شاعیر وەکو کەسێکی هەستیار مامەڵە لەگەڵ ڕووداو و بەسەرهاتەکان کۆمەڵگەکەی دەکات و هەڵوێستەکانی دەبنە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگایەک بۆ وەرگرەکانی، کە چاوەڕوانی لێ دەکەن بۆچوون و گۆشەنیگاکانی خۆی ڕۆشن بکاتەوە. لەمەشدا شاعیر دەکەوێتە ژێر کاریگەری پاڵنەرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتوورییەکانی سەردەمەکەی خۆی، بۆیە (( لەخاڵێکی سەرەتاوە کە ئەویش هەست و نەستی خۆیەتی دەستپێدەکات و ئازارە تایبەتییەکانی خۆی وەک شتێکی جیهانی و نەمر پیشان دەدات، هاوکات دەشێ ئەم دەربڕینی ئازارە بدەینە پاڵ هەموو تاکێکی کۆمەڵ، چونکە گومانی تێدا نییە کاتێک شاعیرێکی مەزن گوزارشت لە خۆی دەکات، لەهەمانکاتدا گوزارشت لە نەوەکەی خۆشی دەکات)) (د.رشاد رشدی، ؟، ص٦٠ ) و دەربڕی ئاوات و ئامانجەکانیان دەبێت. بەمەش شیعر پەیامێک لە شاعیرەوە بۆ خوێنەر و وەرگرەکانی دەگوازێتەوە، ئەو پەیامەش بوونی کۆمەڵایەتی شاعیر دەسەلمێنێ (( چونکە (( شیعر تەنیا نییە، بەڵکو گرێدراوی ژیان و واقیعی ڕۆژانەی مرۆڤە، ئەو شاعیرەی کە بە ئەقڵ بیر دەکاتەوە و بەدڵیش هەست بە بوونی شتەکان دەکات، ناتوانێت لە دوورەوە بە تەنیا تەماشا بکات و گۆڕانکاری لەو واقیعە نەکات کە کۆمەڵگای

گرتۆتەوە)) (ئازاد عەبدولواحید کەریم،٢٠٠٥، ل ١٢٨)، بەم پێیەش شاعیر وابەستەی واقیعە کۆمەڵایەتییەکەی دەبێت و بەوەی کە کەسایەتییەکی وشیار و بە ئاگایە و هەست بە ڕووداوەکانی دەوروبەری دەکات و بەرپرسیاریەتییەکی زۆری لە ئەستۆگرتووە کە لە ویژدانی شاعیرەوە دەخولقێت کە هەڵوێستەکانی لەمەڕ ژیان و کۆمەڵگە دروست دەکات. لەبەر ئەوەش کاتێک شاعیر لایەنێک لە لایەنەکانی کۆمەڵگەکەی پەسەند دەکات و ستایشی دەکات، ئەوا لە ڕاستیدا ستایشی بەهایەک لەناو کۆمەڵگەدا دەکات کە خوازیارە بەنەمری بمێنێتەوەو نەوە دوای نەوە پەرەی پێ بدەن، کاتێکیش پەنا بۆ داشۆرین دەبات، ئەوا ڕوانگە کۆمەڵایەتییەکەی لەبەرچاو گرتووە وهەوڵدەدات ئەو خراپەکارییەی کە بووەتە هۆکاری شێواندنی کۆمەڵگە بوەستێنێت و لە چەند وێنەیەکی هەستیاری شیعردا قێزەونی بکات، بەمەبەستی ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە خۆیان لێی بپارێزن و ئەو ئاکارو کردەوانە دووبارە ئەنجام نەدنەوە. بەو واتایەی کە شاعیر وەکو چاودێرێک وایە بەسەر کۆمەڵگەدا و هەوڵدەدات بەهای کردەوە چاکەکان نەمر بکات و خاڵەلاوازەو کردەوە خراپەرکانیش لەبەردەم چاوی کۆمەڵگە باس بکات و ڕووناکی بخاتە سەری بەمەستی ئەوەی هەستێک لەلای کۆمەڵگە دروست بکات بۆ لەناوبردنیان(د.عبدالقادر الرباعی، ١٩٨٠، ص ٥٠-٥١). ئەو بابەتە کۆمەڵایەتییانەی کە لەشعیریشدا بەکاردەهێنرێن، هەندێکیان دیارو هەستپێکراون و هەندێکی دیکەشیان ڕۆحی و هزرین، ئەم دوولایەنەش لە هزر و ناخی شاعیردا ئاوێتە دەبن و بەیەکەوە جیهانی شیعری شاعیر دورست دەکەن، لێرەشدا کاریگەری نێوان کۆمەڵگەو شاعیر بەدیار دەکەوێت، چونکە بێگومان شاعیر وەکو تاکێک ناتوانێت بەرهەمە هونەرییەکەی خۆی دابهێنێت، ئەگەر کۆمەڵگە بابەتەکانی بۆ فەراهەم نەکردبێت و کەشوهەوای گونجاوی بۆ نەخوڵقاندبێت، لەهەمانکاتیشدا کۆمەڵگەش بەشێوە گشتییەکەی ناتوانی لە ساتە پڕ لە خرۆشەکانی ژیان بژیت، ئەگەر شاعیر خەرمانەی واقیعێکی هۆگری بۆ دروست نەکات(د.عبدالقادر الرباعی، ١٩٨٠، ص ٥٢). بەمشێوەیە ئەو ئەرکەی کە شیعر و شاعیر لە ئەستۆی دەگرن ئەوەیە کە ژیان بگەیەننە بارودۆخێکی گونجاوی کۆمەڵایەتی، ئەمەش هۆکارێکی کاریگەر بوو کە کۆمەڵناسی ئەدەب وەکو زانستێک بایەخ بە پەیوەندی کۆمەڵگەو شیعر بدات و لەم ڕووەو دوو ئاراستە لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی شیعر هاتنە ئاراوە (ا.د.محمد سعید فرح، ا.دمصطفی خلف عبدالجواد، ص ٣٢-٣٣):

ئاراستەی یەکەم:بەشێک لە لێکۆڵەرو ڕەخنەگران لەو باوەڕەدان کە شیعر بەتایبەتیش شیعری لیریکی بەو پێیەی کە دەربڕی هەستەکانی دەروونەو زیاتر بەرەو خود و بواری سۆزداری هەنگاو دەنێت، بۆیە زەحمەتە شرۆڤەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ بکرێت، هەندێکیشیان بڕوایان وایە کە شیعر لە زۆربەی کاتەکاندا نوێنەرایەتی کۆمەڵگە و ڕووداوە مێژووییەکانی ناکات و ئاوڕ لە مەسەلە سیاسییەکان و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ناداتەوە،بەڵکو زیاتر دەربڕی سروشت و ناخی مرۆڤە لە خۆشی و ناخۆشییەکانیدا، بۆیە بەلای ئەوانەوە شیعر بنیادێکی کەمی هەیە کە دەکرێ لە شیکردنەوەی لە ئاستی کۆمەڵایەتی بۆ بکرێت. بەڕای ئەوان تەنیا لەڕێگەی وەزیفەی شیعری لیریکی لە پەیوەندی بە سیستەمی گەیاندنی ئەدەبی و پێگەی شاعیر لەناو کۆمەڵگە و گۆڤارە تایبەتییەکانی شیعرەوە دەتوانرێت شرۆڤەی بۆ بکرێت. لەڕاستیدا ئەوان زیاتر جەختیان لەسەر شیعری لیریکی کردۆتەوە و بەشێوەیەک کە خودییەتی بەسەریدا زاڵ بێت، لێکدانەوە و شیکردنەوەکانیان بۆ کردووە.

ئاراستەی دووەم: لەبەرامبەر ئاراستەی یەکەم و وەکو پەرچەکردارێک هاتە ئاراوە، ئەمانە هەوڵیاندا مانای کۆمەڵایەتی بۆ شیعر لەسەر ئاستی نووسین و زماندا دەستەبەر بکەن. بۆچوونیان لەسەر ئەوە بنیادنا کە ئەو گۆڕانکارییانەی لەسە ئاستی نووسینی شیعر دێنەکایەوە، بریتین لە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕەخنەی کۆمەڵایەتی، سەرەرای ئەمانەش داڕشتنی زمانی شیعری و خوێندنەوەکانی وەکو یاخیبوونێک وایە لەدژی ئەو گوتارە ئایدۆلۆژیانەی کە لەکۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا هەن.

بەڕای لێکۆڵەر و ڕەخنەگرانەوە بۆ شیکردنەوەی لایەنی کۆمەڵایەتی دەقی شیعری، نابێت تەنیا پشت ب پارچەشیعرێک یان قەسیدەیەک ببەسترێت، بەڵکو پێویستە شیکردنەوە وراڤەکردن بۆ ژمارەیەکی زۆر لە دەقی شیعری بکرێت و پەیوندییەکانیان ڕوون بکرێنەوە و لایەنی کۆمەڵایەتی وسیاسی و مێژوویی و ژینگەییان دیاربکرێن، بۆ ئەوەی گوتار و جیهانبینی شاعیر ڕوون بکرێتەوە (ا.د.محمد سعید فرح، ا.دمصطفی خلف عبدالجواد، ٢٠٠٩، ص ٣٢-٣٣).

**سەرچاوە:**

١. ئازاد عەبدولواحید کەریم، سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٥.
٢. د.عبدالقادر الرباعی، الشعر والواقع الاجتماعی في النقد الحدیث، مجله الأقلام، عدد(٨)، ١٩٨٠.
٣. د.رجاء عید، فلسفة الألتزام فی النقد الآدبی، دار الثقافة للطباعة والنشر، ١٩٧٤، ص٨٤.
٤. د.رشاد رشدی، مختارات من النقد الأدبی المعاصر، مکتبة الأنجلو المصریه، مطبعة العلوم، المصر، ص٦٠.
٥. ا.د. محمد سعید فرح،ا.د.مصطفی خلف عبدالجواد. علم اجتماع الأدب، دار المسیرة للنشر و والتوزیع و الطباعة، عمان، ٢٠٠٩.

# یەکەمین کۆنگرەی نانۆ تەکنەلۆجی و پراکتیککردنەکانی لەزانکۆی سەلاحەدین بەڕێوەچوو

بەئامادەبوونی وەزیری پیشەسازی و بازرگانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پ.د.ئەحمەد ئەنوەر دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین، وەزیری پیشەسازی حکومەتی عێراقی فیدرال، یەکەمین کۆنگرەی نانۆ تەکنەلۆجی و پراکتیککردنەکانی بەهاوبەشی زانکۆی سەلاحەدین و زانکۆی مەلایا لە وڵاتی مالیزیا و وەزارەتی پیشەسازی عێراقی فیدرال لەهۆڵی کۆچەر بیرکاری سەنتەری رۆشنبیری زانکۆی سەلاحەدین ئەنجامدرا، ئەمەو لەسەرەتادا مارشی نیشتمانی عێراق و هەرێمی کوردستان بەدەقیقەیەک وەستان پێشکەشکرا، لەپاشاندا سەرۆکی کۆنگرەکە بەرنامەی کاری کۆنگرەکەی پێشکەشکرد، هەروا وتارێک لەلایەن نوێنەری دەستەی پیشەسازی عێراقی فیدرال پێشکەشکرا، سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین لەوتەیەکدا باسی لەهەموو ئەو کۆنگرانە کرد، کە لەزانکۆی سەلاحەدیندا ئەنجام دەدرێ، جەختی لەوە کردەوە، کە هەردەم زانکۆی سەلاحەدین لەمیوانداری کۆنگرە و بەشداریکردنی کۆنگرەکان بەردەوامبووە، لەم کۆنگرەیەشدا مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین بەشدارن، هەروا جەختیشی لەوە کردەوە، کە نانۆ تەکنەلۆجی ئێستا لەزۆربەی بوارەکانی زانستدا بوونی هەیە بەتایبەتیش لەرووی پیشەسازی و پزیشکیدا، هەروا مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین لەم بابەتەشدا پێشەنگی ـ ناوچەکە و زانکۆکانن ئەمەش بەبەشداریکردنیان لەهەموو ئەو کۆنگرانەی لەبواری نانۆ تەکنەلۆجیدا لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا ئەنجام دەدرێ.

لەلایەکی دیکەوە ئەم کۆنگرەیە ٢ رۆژ دەخایەنێت و ٨٧ توێژینەوە لەخۆ دەگرێ و دابە شکراوەتە سەر (٣) تەوەر، ئەمەو تەوەری یەکەم سەبارەت بە پراکتیکی بایۆتەکنەلۆجی و تەوەری دووەمیش بەناویشانی دروستکردن و خەسڵەتەکانیەتی، هاوکات تەوەری سێیەمی بەناونیشانی نانۆ وەزیە.

لەکۆتایی مەراسیمەکەش لەلایەن وەزیری پیشەسازی و بازرگانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزیری پیشەسازی عێراقی فیدرال، پ.د.ئەحمەد ئەنوەر دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین لۆگۆی بەشداربووەکان پێشکەش بە توێژەران و جێبەجێکارانی کۆنگرەکە کرد.






# یەکەمین کۆنفرانسی پێشبڕکێی پێدانی گرانتی نێوخۆیی زانکۆ بە قوتابیان لە زانکۆی سەلاحەدیندا

بەچاودێری سەرۆکی زانکۆی سەلاحەددین یەکەمین کۆنفرانسی پێشبڕکێی پێدانی گرانتی نێوخۆیی زانکۆ بە قوتابیان لەهۆڵی کۆچەر بیرکار لەسەنتەری رۆشنبیری زانکۆ سازکرا، ئەمەو لەو کۆنفرانسەدا لەسەرەتادا سەرۆکی زانکۆ جەختی لەبەرەو پێشوونی هەموو لایەنەکانی ئاستی زانست کردەوە بەتایبەت لەنێوەندی کۆلیژەکانی زانکۆی سەلاحەدین، باسیشی لەوە کرد مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین توانیویانە بەشداری بکەن لەزۆربەی جۆرناڵەکانی توێژینەوەی زانکۆ بەناوبانگەکان، دیارە ئەمەش کاریگەری دەبێ لەسەر هەریزبەندی نیشتمانی و نێودەوڵەتی زانکۆکانی جیهان، لەلایەکی دیکەوەش دەستخۆشی لەو قوتابیانە کرد، کە لە و پێشبڕکێیەدا بەشدار بوونە، ئەوەشی راگەیاند بۆ هەموو ئەو قوتابیانەی توانیویانە لەپرۆژەکانیان سەرکەوتوو بن ئەوا پاداشت دەکرێن، هاوکات زانکۆی سەلاحەدین توانیویەتی دەستپێشخەر بێ لەسازدانی ئەو کۆنگرەیە، هیوامان وایە لەداهاتوودا ئەم جۆرە پێشبڕکێیە بەردەوام بێ.
لەپاشاندا پ.د. نەبیل عادل فەخری بەڕێوەبەری دڵنیایی جۆری لەسەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین وتارێکی بەبۆنەی ئەو پێشبڕکێیە پێشکەشکرد و تیایدا باسی لەهەڵسەنگاندن و پێشکەشکردنی پرۆژە و بابەت و توێژینەوەکان کرد، کە لەلایەن مامۆستاکانیانەوە سەرپەرشتی دەکرێن.
هەر لەوێدا دەستکرا بە پێشکەشکردنی پرۆژە و ئایدیایەکان بۆ ئەمەش دوو هۆڵ دەستنیشانکرا، دوای کۆتایی هێنان بە پرۆژەکان سەرجەم قوتابییە توێژەرەکان خەڵات دەکرێن، هەروا بەپێی پێوەرەکان یەکەم و دووەم خەڵاتی باشترین توێژینەوە و ئایدیا وەردەگرێ.
لەپاشاندا سەرۆکی زانکۆ سەردانی گفتوگۆی نامەی ماستەر قوتابی (دلڤین ستار) کرد.
هەر لەوێدا سەرۆکی زانکۆ سەردانی سەنتەری پێداگۆجی کرد و لەنێوەندی وتارێکدا جەختی لەخوێندن و پەروەردە و هەموو ئەو پێوەرانەی، کە گەلانی جیهان بەرەوپێشەوە دەبات، زیاتریش هانی بەشداربوانی خولی پێداگۆجی کرد و جەختی لەوە کردەوە هەوڵەکان دەبێ بەردەوام بێ تا بتواندرێ بەجوانترین شێوە وانە و بابەت و توێژینەوەکان بخرێتە روو.



پاش هەڵسەنگاندنی سەرەتایی بۆ هەریەک لە پرۆژەی دەرچوونەکان و ئایدیای قوتابییەکان، کۆی هەمووی ئەو پرۆژە دەرچوونانەی کە داوای گرانتی نێوخۆیی زانکۆیان کردووە(٣٩) پرۆژەیە، کۆی ئەو ئایدیایانەی کە داوای گرانتی نێوخۆیی زانکۆیان کردووە(١٧) ئایدیایە لە سەرجەم کۆلێژو بەشەکان.

سەبارەت بە وادەی ئەنجامدانی کۆنفرانس بۆ باشترین پرۆژەی دەرچوون و باشترین ئایدیا لەسەر ئاستی کۆلێژەکان، ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٢/٦ کاتژمێر (٩) دەستنیشانکرا بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکە، هەروەها بۆ هەر پرۆژەی دەرچوون و ئایدیایەک ماوەی (١٠) دەخولەک دەدرێت بۆ پێشکەشکردنی.

سەبارەت بە میکانیزمی پێدانی گرنتەکان و بڕی گرانتەکان، پێشنیارکرا کە بەمشێوەی خوارەوە بێت:

١.بۆ باشترین پرۆژەی دەرچوون لەسەر ئاستی کۆلێژێک بڕی(٢٠٠,٠٠٠)دوو سەد هەزار دینار.

٢.بۆ باشترین ئایدیا لەسەر ئاستی هەرکۆلێژێک بڕی(١٢٥,٠٠٠) سەدو بیست وپێنج هەزار دینار.

٣. بۆ ئەو پرۆژە دەرچوونانەییتر کە سەرکەوتووبوون لە هەڵسەنگاندنی بەرایی لیژنەکە بڕی(١٣٠,٠٠٠) سەدو سی هەزار دینار.

٤. بۆ ئەو ئایدیانەی کە سەرکەوتووبوون لە هەڵسەنگاندنی بەرایی لیژنەکە بڕی(٧٥,٠٠٠) حەفتاوپێنج هەزار دینار.

سەبارەت بە ڕێزلێنان بۆ بەشداربووانی یەکەمین کۆنفرانسی باشترین پرۆژەی دەرچوون و باشترین ئایدیا، پێشنیارکرا کە سوپاس و پێزانینی سەرۆکی زانکۆ ئاراستەی هەموو ئەو قوتابیانە بکرێت کە پرۆژەی دەرچوونەکانیان و ئایدیاکانیان سەرکەوتووبوون و هەروەها سوپاس و پێزانینی سەرۆکی زانکۆ ئاراستەی سەرپەرشتیاری پرۆژەی دەرچوونەکانیش بکرێت.



# خەرمان بەرەکەت









## پ.ی.د. ئاریانا ئیبراهیم محەمەد

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە بواری رۆژنامەوانی
بەشی راگەیاندن/کولێژی ئاداب/زانکۆی سەلاحەدین

وەک شانازی بە خۆکردنێکی زانکۆ بەو مامۆستا و داناو زانایانەی مێژووی زانکۆی سەلاحەدینیان بە بەرهەم و داهێنانە زانستی و هزری و هونەرییەکانی خۆیان رازاندۆتەوە، هەر جارەو یەکێ لەو مامۆستا داهێنەرانە و بەرهەمە بە پێزەکانیان دەخەینە روو، بۆ ئەمجارە (پ.ی.د. ئاریانا ئیبراهیم محەمەد) هەڵبژێردراوە، کە ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی هەیە لە بواری توێژینەوەو کتێبی بە نرخ ...










## کورتەنامەی ژیانی ئەکادیمی و ڕۆژنامەوانی و هونەری و ئەدەبی

*** ئەکادیمی:**

- لە ساڵی ٢٠٠٤ بڕوانامەی ماستەر لە بواری زمان و هونەرەکانی ڕۆژنامەوانی وەرگرتووە.
- لە ساڵی ٢٠٠٥ مامۆستای زانکۆ، لە بەشی ڕاگەیاندن کۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین.
- ساڵی ٢٠٠٥ دامەزرێنەر و یەکەم سەرنووسەری گۆڤاری زانکۆی نوێ لە سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین.
- ساڵی ٢٠٠٦ – ٢٠٠٩ بڕیاردەری بەشی ڕاگەیاندن، کۆلێژی ئەدەبیات زانکۆی سەلاحەدین.
- ساڵی ٢٠١٢- ٢٠١٧ سەرپەرشتیاری ڕاگەیاندن لە سەنتەری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی زانکۆی سەلاحەدین،
- لە ساڵی ٢٠٠٥ ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ئەندامی کارا.
- لە ساڵی ٢٠٠٥ ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵینەو توێژینەوە و وتاری جۆراوجۆر لە چەندین گۆڤارو ڕۆژنامە بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوکردۆتەوە.
- لە ساڵی ٢٠١١ بڕوانامەی دکتۆرا لە پسپۆڕی زمان و هونەرەکانی ڕۆژنامەوانیدا وەرگرتووە.
- لە ساڵی ٢٠١١ بەشداری چەندین کۆنگرە و کۆنفرانسی زانستی لەناو و دەرەوەی هەرێمی کوردستان و وۆرکشۆپ و دیبەیتی ئەکادیمی و پێشکەش کردنی دەیان سیمیناری لە بواری ڕۆژنامەوانیدا.
- لە ساڵی ٢٠١١ ئەندام و سەرۆکی دەیان لێژنەی گفتوگۆی زانستی بۆ ماستەر و دکتۆرای بەشی ڕاگەیاندن.
- لە ساڵی ٢٠١٢-٢٠١٧ سەرپەرشتی چەندین لێژنە و کۆبوونەوەی تایبەت و ئەنجامدانی خول و ڕاهێنانی ڕۆژنامەوانی سەبارەت بە کارو پیشەی ڕۆژنامەوانی هەروەها کۆمەڵە خول و ڕاهێنانی پراکتیکیش بۆ ڕۆژنامەنووسان و ڕاگەیاندکارانی نیو دەزگا ڕاگەیاندنەکان بەگشتی.
- لە ساڵی ٢٠١٥ نازناوی زانستی (پرۆفیسۆری یاریدەدەر) لە بەشی ڕاگەیاندن وەرگرتووە.
- لە ساڵی ٢٠٠٥-٢٠١٩ ئەندامی لێژنەی زانستی بەشی ڕاگەیاندن و سەرپەرشتی چەند لێژنەی دیکەی زانستی لەسەر ئاستی بەش و کۆلێژ و زانکۆ.
- کتێبە چاپکراوەکان:

١- ماستەرنامە (برایی-برایەتی ١٩٦٧-١٩٧٤) ڕۆڵی لە پێشخیتنی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا).
٢- تێزی دکتۆرا (شێوازە ئەدەبیەکانی ڕۆژنامەی خەبات (٢٠٠٣-٢٠٠٦)

**لە ساڵی ٢٠١٨-٢٠١٩ چەندین کتێبی بە چاپگەیاندووە وەک:**

١- چاوخشانێک بەنێو مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی.
٢- زمانی ڕاگەیاندن
٣- وێنەی ڕۆژنامەوانی
٤- دەرهێنانی ڕۆژنامەوانی
٥- دیزاینی ڕۆژنامەوانی.
٦- ڕێکلامی ڕۆژنامەوانی.
٧- ڕۆژنامەی خەبات.
٥- چەند کتێبیکی دیکە لە ژێر چاپدان: (میتۆدەکانی توێژینەوە لە ڕاگەیاندندا، گوتاری ڕاگەیاندن، نووسینی ئەلیکترۆنی، ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی، سەلامەتی پیشەیی ڕۆژنامەنووسان).

**توێژینەوە زانستییەکان:**

١- زمانی ڕاگەیاندن لە دوای ئازادیکردنی عیراق ٢٠٠٣.
٢- شێوازەکانی دیزاینی ڕۆژنامەوانی لە ڕۆژنامە










کوردییەکان
٣- شێوازەکانی دەرهێنان لە رۆژنامە کوردییەکان
٤- شێوازەکانی وێنەی رۆژنامەوانی لە رۆژنامە کوردییەکان
٥- ئەدەبیاتی رێکلام لە رۆژنامەوانی کوردیدا
٦- لاگیری جێندەر لە ئەدەبیاتی رۆژنامە کوردییەکان
٧- بەپرسیارییەتی ئافرەتی کورد لە نێو کۆمەڵگادا
٨- کاریگەری هەڵمەتەکانی راگەیاندن لەسەر سەرنجراکێشانی خەڵک بۆ پرسە نەتەوەییەکان
٩- کاریگەری رۆماڵی هەواڵی لەسەر هۆشیارکردنەوەی جەماوەر بە پرسە نیشتمانییەکان
١٠- شێوازەکانی نووسینی هەواڵ لە رۆژنامەگەریی ئەلیکترۆنیدا
١١- پەیوەندی نێوان نووسین و خوێندنەوەی لەنێو ئامرازەکانی رۆژنامەوانیدا
١٢- کاریگەری گوتاری راگەیاندن لەسەر هۆشیاری جەماوەری لەپرسە نیشتمانیەکان
١٣- شێوازەکانی نووسینی ئەلیکترۆنی بۆ بە بازارکردن لە پێگە ئەلیکترۆنییەکان
١٤- شێوازەکانی نووسینی چاوپێکەوتن لە گۆڤاری رامان
١٥- شێوازەکانی پەیوەندی سیاسیی بۆبە بازارکردنی سیاسیدا لە هەرێمی کوردستان.
١٦- گیروگرفتی رێنووسی کوردی لە رۆژنامەوانی کوردیدا.
١٧- کاریگەری شێوازەکانی نووسینی هەواڵ لە پێگە ئەلیکترونیەکان لەسەر تێگەیشتنی خوێنەر.

*** رۆژنامەوانی:**

١- یەکەم نووسین رۆژنامەوانی، وتارێک بوو بە زمانی عەرەبی لە گۆڤاری زاگرۆس کە لە وەزارەتی رۆشنبیری بە زمانی عەرەبی دەردەچوو.
٢- چەندین وتار و بابەتی رۆژنامەوانی لە رۆژنامە کوردییەکان بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بلاوکردۆتەوە بۆ نموونە لە: (برایەتی، خەبات، روانین، هاوارا نو، ئەڤرۆ، هەولێر، کاروان، رامان .. هتد).
٣- سەرنووسەری یەکەم گۆڤار لە زانکۆی سەلاحەدین بەناوی (زانکۆی نوێ) بووم.
٤- ئەندامی دەستەی نووسەرانی (هاوارا نو) کە بنکەی کاوا بۆ چاندی کوردی دەردەکرد.
٥- بەشداری چەندین کۆبوونەوەی تایبەت بە بواری رۆژنامەوانی وەک سەرپەرشتیار و شارەزا.

*** هونەری:**

١- یەکەم پێشانگای شێوەکاری ساڵی ١٩٩٨ لە گەلەری میدیا بەناوی (زەنگ) کرایەوە.
٢- ئەندامی سەندیکای هونەرمەندان لە ساڵی ٢٠٠١ تاکو ئێستا.
٣- بەشداری چەندین پێشانگای شێوەکاری ترم کردووە بە هاوبەشی لە بۆنە تایبەتەکان بۆ نموونە لە بۆنەی (٨) ی مارسی رۆژی جیهانی ئافرەتان.

*** ئەدەبی:**

١- لە ساڵی ٢٠١٤ نووسینم شیعریم هەیە و لە پەیجی تایبەتی فەیسبووکی خۆم بلاومکردۆتەوە.
٢- ساڵی ٢٠١٩ یەکەم دیوانی شیعریم چاپ و بلاوبووە بە ناوی (خزامە باوەشی و پێکەنیم).
٣- کتێبی ترم لە ژێر چاپدایە (شیعر و رۆمان).

# ١١٩ قوتابی بەشداریان لە چالاکییەکانی دێدەوانی کرد

دێدەوانی و خیوەتدانان لەلایەن قوتابیان یەکێکە لەو چالاکییانەی کە لەزۆربەی قوتابخانە و زانکۆکانی وڵاتان دادەنرێ، چونکە چالاکی دێدەوانی هەوڵێکە تا قوتابیان لەهەموو رووەکانەوە بەگرووپ لەکاردابن، بەتایبەت ئەو چالاکییانەی کە پێویست دەکات بەگرووپ ئەنجام بدرێ، لێرەدا قوتابی جگە لەوەی سروشتێکی جوان دەبینی، بۆ نموونە لەنێوەندی دارستانەکان کاتێک خیوەتێک هەڵدەدەن، لەوێدا فێری ئەوە دەبن، چۆن پشت بەخۆیان ببەستن، یاخود چۆن متمانەیان بەخۆیان هەبێ، یان چۆن متمانەیان بەهاوڕێیەکانیان هەبێ، لەم رووەوە زۆرێک لەلایەنەکانی ژیان بەدەردەکەوێ، جگە لەتوانا جەستەییەکان، بۆ چەند ساتێک یام چەند رۆژێک لەنێوەندی ئەو سورشتەدا شارەزایی هاوڕێیەکانیان دەبن، لەلایەکی دیکەوە هەموو چالاکییەکانی دێدەوانی جۆش و خرۆش دەبەخشێتە خودی قوتابی تا بتوانێ لەداهاتوودا سوود لەو ئەزموونەی وەربگرێ.

هاوکات لە رێکەوتی ٢٠١٩/١٢/٢١ بە ئامادەبوونی، سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین ڕاگری کۆلیژ و پ.د. حسێن سەعدی ئیبراهیم خێوەدگای دێدەوانی بۆ قوتابیانی قۆناغی یەکەم بە سەرکەوتووی ئەنجامدرا، ١١٩ قوتابی بەشداری لەم دێدەوانیە کردبوو، ئەوەی شیاوی باسە وانەی دێدەوانی یەکێکە لە وانەکانی پرۆگرامی خوێندنی قۆناغی یەکەمی کۆلیژ.

ساڵانەش قوتابیانی کۆلیژی پەروەردەیی جە ستەیی و زانستە وەرزشییەکان دێدەوانی ئەنجام دەدەن، هەر لەوێدا وانەی دێدەوانی دەگوترێتەوە، ئەوە جگە لەچەندین چالاکی وەرزشی لەلایەن قوتابیان و مامۆستایانەوە ئەنجام دەدرێ، بۆیە وەک لەسەرەتادا باسمان لێوە کرد دێدەوانی و خیوەتدانان ئینجا لەهەر شوێنێک بێ خودی خۆی چالاکییە قوتابیان رادەهێنێ تا بتوانن بەردەوام بن لەچالاکییەکانیان بەتایبەتی لەنێوەندی سروشتێکی رەنگیندا.

**کاروان حەمە سەعید**
**راگەیاندنی کۆلیژی پەروەردەیی جەستەی و زانستە وەرزشییەکان**





## (٦) قوتابی رووسی، بەه




زمان ئامرازێکە بۆ بەیەکەوەزە بەستن و تێگەیشتن لە کلتووری گەلان و هەموو ئەو رۆشنبیریانەی، کە لەدووتوێی گەلاندا بەدی دەکرێ، بۆ ئەمەش ئێستا بۆ فێربوونی زمان چەندین سەرچاوە لەبەردەستدایە بۆ فێربوونی زمان، وەک پێشتر نییە، تا بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەوڵاتێکدا نیشتەجێ بیت تا فێری زمانەکەیان بیت، هۆکارەکانی زانیاری لەهەموو روویەکەوە ئێستا لەبەردەستە بۆ فێر بوونی زمان وەک ئینتەرنێت و فەرهەنگە ئەلیکترۆنییەکان، ئەوەی جێگەی دڵخۆشییە بەشێک لە نەوەکانی ئێستا جگە لەزمانی دایک زمانێکی دیکە دەزانن و هەندێکجاریش چەند زمانێکی دیکە دەزانن ئەمەش لەرێگەی تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان و یوتیوب، بەڵام هەر هەموو ئەمانە لەلای زۆر کەس تێنوویەتی تەواو ناشکێنێ بۆ فێربوونی زمان بەتەواوی بۆیە ئێستا زۆرێک لەپەیمانگە و کۆلێژەکانی جیهان سەرەڕایی هەر هەموو ئەو زانیاریانەی لەبەدەستیاندایە، قوتابی و خوێندکارانیان دەنێرن بۆ وڵاتان و نێو نەتەوەکان تا لەنزیکەوە زمانەکانی دیکەی گەلان لەلایەن خوێندکارانیانەوە فێر ببن، بۆ ئەمەش زۆر جار لێرەولەوێ دەبینین چەندین خولی زمان دەکرێتەوە، بەڵام ئەمە نابێتە بارتەقای ئەوەی خودی کەسەکە لەنێوەندی دۆخەکەدا بژێت.



# ـــۆی خولێک فێری زمانی کوردی و عەرەبی بوون

لێرەدا باس لەشەش کوڕ و کچی رووسی دەکەین، کە لەمۆسکۆوە هاتوونەتە کوردستان تا لەنزیکەوە ئاشنایەتیان هەبێ لەگەڵ زمانی کوردی و زمانی عەرەبی وەکخۆیان ئاماژەیان پێدا هەر شەشیان خۆشەویستیان بۆ هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی هەیە، بۆیەش هاتوونەتە کوردستان تا لەنزیکەوە ئاشنایەتییەکی تەواویان هەبێ لەگەڵ هەردوو زمان و هەردوو کلتوور.
لەم رووەوە «رۆمان زمالنی» لەگەڵ (٥) هاوڕێی لەزانکۆی مۆسکۆوە بەفەرمی هاتوونەتە کوردستان، واتە (٤) کوڕ و (٢) قوتابی کچی، (٣) لەوانە بۆ ماوەی شەش مانگ لەکۆلیژی زمانی زانکۆی سەلاحەدین بەپراکتیکی و لەنزیکەوە فێری زمانی کوردی و عەرەبی بن، هاوکات «رۆمان زمالنی» تەمەنی ٢٣ ساڵە بەجۆش و خرۆشەوە لەگەڵ هاوڕێییەکانیان هەنگاویان نا، تا لەکوردستان و بەتایبەتی لەشاری هەولێر بەکردەیی شارەزایی کلتوور و زمان بن، ئەو باسی لەوە کرد مەبەستی لەفێر بوونی زمانی عەرەبی تا لەداهاتوودا لەوڵاتانی عەرەبی کار بکات، جەختیشی لەوە کردەوە لەهەولێر هەموو هاوڕێییەکانی قوتابی کورد بوون بۆیە بەشێک لەزمانی سەرەتایی زمانی کوردیش فێر بوومە، لێرە شارەزایی زۆر شت بووم، کە پێشتر نەمدەزانی، «ئەمە دەروازەیەکی گەورە بوو تا لەنزیکەوە شارەزا و ئاشنای گەلێک بم و بەشێک لەکلتوور و رۆشنبیریەکەی لەنزیکەوە ئاشنایەتیم لەگەڵیدا هەبێ»، لەلایەکی دیکەوە جەختی لەوە کردەوە ئەو (٣) کەسەی دیکە، کە خۆلیان لەسەر زمانی کوردی کرد زۆر زووتر فێر زمانی کوردی بوون، چونکە «چ لەناو کۆلیژ یان لەدەرەوەی کۆلیژ هەموو بەزمانی کوردی دەدوان ئەمەش وایکرد زۆر زووتر ئاشنایەتی لەگەڵ خەڵک و زمان و کلتوور و رۆشنبیری و ژیان هەبێ»، لەدرێژەی قسەکانیدا ئەوەشی خستە روو «دیارە زمانەکان هەر یەکەو چەندین شێوەزاری هەیە، بەرنامەم هەیە لەداهاتوودا فێر شێوەزارەکانی کوردی و عەرەبی ببم بەتایبەتیش عەرەبی، چونکە وەکخۆم زیاتر دەمەوێ پسپۆڕیم لەزمانی عەرەبی هەبێ، بەڵام ئەو (٣) هاوڕێیەی دیکەم ئەوانیش لەجێگەی خۆیانەوە دەیانەوێ فێری شێوەزارەکانی کوردی ببەن، تا بەتەواوی بتواندرێ سوود لەهەموو لایەنەکانی زمان وەربگیرێ».
ئەوەی شیاوی باسە زانکۆی سەلاحەدین چەندین کورسی زمان بۆ بیانییەکان دەکاتەوە دیارە ئەمەش بەپێی رێککەوتنی نێوان زانکۆکانە، ئەمەش وادەکات پەیوەندیەکی پتەوە لەنێوەندی زانکۆکاندا بێتەئاراوە.




**وەرگێڕانی م. امیر محمد محمدامین**

زانکۆی سەڵاحەددین- هەولێر کۆلێژی پەروەردەی مەخمور
بەشی زمانی کوردی


# قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەری لە ئەوروپا

**قوتابخانە زمانەوانییە بونیادگەرییەکانی ئەوروپا:**

١- قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی جنێف (قوتابخانەی زمانەوانیی دی سۆسێر):

قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی جنێف قوتابخانەیەکی زمانەوانیی نوێیە، کە ناونراوە بە قوتابخانەی زمانەوانیی دی سۆسێر لە جنێف دامەزراوەو چاکی ئەم قوتابخانە زمانەوانییە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە دەستی کرد بە قۆناغێکی نوێ لە قۆناغەکانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا.

هەروەها توێژینەوەی زمانی لە سەر پرۆگرامێکی نوێ کرد، کە لە سەر بنچینەیەکی دیاریکراو هەڵدەستا. ئەم قوتابخانە زمانەوانییە وای دەبینی، کە زمان کۆمەڵە ڕەگەزێکی ئاڵۆزەو هیچ ڕەگەزێک لەگەڵ ڕەگەزەکانی تر دوور ناکەوێتەوە.

هەروەها بینیان، کە زمان کۆمەڵەیەکە لە ڕەگەزی ئاڵۆز لەگەڵ هەندێکیان، کە هیچ ڕەگەزێک لە دەرەوەی ئەم ڕەگەزە ئاڵۆزە نرخ وبەهای نییە و پەیوەندی بە هیتر نییە. یان زمان سیستەمێکە لە نیشانەکانی زمانەوانی لەگەڵ هەندێکی تر کە بە کۆمەڵێک لە پەیوەندییەکان دەبەسترێتەوە.

بێگومان دی سۆسێر بە ڕێگەی زانستی بابەتی لە سنوری وەسف و ڕاڤە و شیکردنەوە وەستایەوە.

**بنەما بنچینەییەکانی تیۆری دی سۆسیر ئەمانەن:**

١- کاریگەری ناوەوەو کاریگەری دەرەوە زمان: کاریگەری ناوەوەی زمان لە سەر سیستەمێک پێکدێت، کە ئەمەیان زمان پێی هەڵدەستێت و گرنگترین کاریگەرییە، کە بە توێژینەوەی سیستەمی زمانەوانیی ناوەوە هەڵدەستێت بەڵام کاریگەری دەرەوەی زمان بە کۆمەڵگەی زمان و ئاداب و ڕۆشنبیری و شارستانییەتیەکەیەوە دەبەسترێتەوە.

دی سۆسێر وایدەبینێ کە بێگومان هەردوو ڕەهەندەکە هیچیان بە یەکترییەوە نەبەستراونەتەوەو هیچیان کاریگەریان لە سەر یەکترییەوە نییە، نموونەیەک بۆ ئەمە، یاری شەترەنجە، کە یاریزانی شەترەنج هیچ شارەزاییەکی پێ زیاد ناکات، ئەگەر زانی سەرچاوەی یارییەکەی ئەوان ئەسپە.

٢- توێژینەوەی زمان لە خۆیەوەو بۆ خۆی:
دی سۆسیر وای دەبینێ، کە ئامانجی سەرەکی لە زانستی زمان بریتییە لە توێژینەوەی زمان لە خودی خۆیەوە بۆ خودی خۆی و بێگومان توێژینەوەی زمانەوانی لە سەر زمان دەکرێت، بەو پێیەی کە ماددەیەکی سەرەکییە، بێگومان زمان سیستەمێکە لە هێماکان و ئاماژەکان لە ژێر ڕۆشنایی زانستێکی گشگیردا کە پێی دەگووترێت هێمالۆجی. ئەڵبەتە زمان بریتییە لە چەترێکی بیریی بۆ کۆمەڵگە، کە ئەویش لە ڕۆشنبیری و مێژووەکەی پێکدێت. بێگومان ئەرکی سەرەکی زمان بریتییە لە گەیاندن و پەیوەندیکردن لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا.
٣- توێژینەوەی دی سۆسیر بۆ زمان، چۆن دی سۆسیر توێژینەوە بۆ زمان کرد؟
بێگومان توێژینەوە دی سۆسێر بۆ زمان توێژینەوەیەکی وەسفییە، هەر وەکو پێشتر توێژینەوەیەکی مێژوویی بوو. دی سۆسێر وای دەبینێت، کە بێگومان توێژینەوە لە سەر زمان دەبێت توێژینەوەیەکی وەسفی ئێستایی بێت، کە پێی دەگووترێت سینکرۆنی، کە بێگومان توێژینەوە بە شێوەیەکی جێگیر (ستاتیکی) بە بێ هەبوونی کاریگەری بۆ کاتی ڕابردوو. توێژینەوەی مێژوویی توێژینەوە دەکات لە بارەی کۆسپ و تەگەرەی پشت بەستراو لە سەر جوڵانەوەو پێشکەوتنی مێژوویی بۆ زمان و گۆرانی کاتی لە زمان ، لە بەر ئەوەی زمان بە پێی تێپەرینی کات و بە دواداهاتنی سەدەکان پێشدەکەوێت.
بێگومان زمان واقعێکی لیستەیە لە خودی خۆی بۆ هەموو کاتێک لە کاتەکاندا.
٤- گوتن و زمان:
دی سۆسێر هاوسەنگی لە نێوان گوتن و زماندا دەکات، کە گوتن ئامرازێکی مرۆڤە بۆ زمان، بەو هۆیەوە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو لە ناو کۆمەڵگە دیاری دەکات، کە زمان ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییە سەربەخۆیە بۆ تاک پێکدەهێنێت و زمان حەقیقەتێکی دەروونی کۆمەڵایەتییەو سیستەمێکی نموونەییە لە زهنی هەموو تاکێک لە تاکەکانی کۆمەڵگەو کە زمان بە هۆی گوتنەوە نوێنەرایەتی دەکات.
٥- زمان:
زمان لای دی سۆسێر سیستەمێکە لە ئاماژەکان، کە بە زمان دەردەبرێت و بێگومان پەیوەندی لە نێوان ئەو ئاماژانەو واتاکانیان پەیوەندییەکی گۆترەییە واتە بە رێککەوت نییە، بە بەڵگەی ئەوەی جیاوازی ئاماژەکان وا دەکات رابەرایەتی لە دامەزراندنی هێمالۆجی بکات.
وا دەبینرێت، کە زمان سیستەمەو پێویستە بونیادی ئەو سیستەمە بۆ پێکهێنانی، یەکەی هەبێت و کاریگەری ئالوگۆری لە سەر هەندێکیان هەبێت.
دی سۆسێر داوای شیکردنەوەی بونیادەکە (سیستەمەکە) و دۆزینەوەی رەگەزەکانی وەکو هێماو وێنەو میوزیک لە ریشاڵی پەیوەندییەکانی زمانەوانیدا دەکات، بۆ زانینی سەرەداوی بونیادی زمان لە ناوەوەو دەرەوەیدا، پێویستە توێژینەوە لە بارەی کۆمەڵێک لە رەگەزە ئاڵۆزەکانی ئەو سیستەمە بکرێت.
ئەو سیستەمە لە کۆمەڵێک نیشانەی زمانەوانی (دەنگەکان) پێکدێت، نیشانەی زمانەوانی بریتییە لە وێنەی دەنگی کە (دال)ەو دالیش واتە وێنەی بیستراو، کە دەچێتە گوێی گوێگر، کە گۆدەکرێت بە ئاماژە یان ئاماژەکان، کە پەیوەندی بە لایەنی فیزیکی هەیە لە کاتی دەربڕین، بەڵام (مدلول) بە واتای ئەوەیە، کە گوێگر لە وێنەی بیستراوەوە دەیگۆڕێت بە وێنەی چەمکی یان واتادار، یانیش بە واتای ئەوەیە، کە پەیوەندی بە لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە هەیە لە کاتی دەربڕین، بەڵام نیشانە یان هێما بریتییە لە وێنەیەکی زهنی( ئاوەز) کە لە دال و مدلول پێکدێت.
**تیۆری دی سۆسێرو ئەو بیرورایانەی لە بارەیەوە**
بێگومان دی سۆسێر جیاوازی لە نێوان چەمکەکان و زاراوەکان کردووە، بەم شێوەیە:
زمان (اللسان )، و گوتن (الكلام) ،و زبان (اللغة)
زمان (اللسان) دەربڕینێکە لە سیستەمی بەیەکگەیاندن یان بریتییە لە پێوەرێک یان کۆمەڵێک یاسای توکمەیە بۆ بەیەکگەیاندنی مرۆڤەکان، کە دەبێت لە ژینگەیەکی زمانی هاورەگەزدا بێت. یان زمان (اللسان) بریتییە لە کۆمەڵێک وێنەی گۆکراوی هەبوو لە مێشکی کۆمەڵە کەسێک.
زمان (اللسان) بریتییە لە درێژبوونەوەی گوتنی بە یاسا، کە بە شێوەی بەرجەستە رێکی دەخات.
بەڵام زبان (اللغة) شای مرۆڤایەتییە، کە مرۆڤ لە سەرجەم بوونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە، تاک لە هەڵبژاردنی یەکەکانی و سیستەمی رێزمانەکەی سەربەست نییە، لە بەر ئەوەی لە کۆمەڵی زمانی بە میرات بۆی ماوەتەوە.
گوتن (الكلام) بریتییە لە ئاخاوتنی دەربراو بە شێوەیەکی کردەیی لە قسەکەرێکی تاک، کە واقعێکی بەرجەستەی راستەوخۆیەو لەوانەیە بە بێگومانی بە شێوەیەکی راستەوخۆ درکی پێ بکرێت، لە دواییدا راستییەکی تاکییەو کۆمەڵایەتی نییە، بەڵام زبان (اللغة) گوتنێکە کە قسەکەر دەریدەکات، یان زبان (اللغة) گوتنێکی شاراوەی بەهێزە، کە بریتییە لەوەی کە تاک و کۆمەڵگە لە یەک ساتدا خاوەنیەتی، لەبەر ئەوەی زبان (اللغة) بە تەنها واقعێکی کۆمەڵایەتی نییە، چونکە تاک بەشداری تێدا دەکات.
پاشان زبان (اللغة) لە زۆر بواردا وەک فیزیکی و فسیۆلۆجی و دەروونی خەملاندنی بۆ دەکرێت و بەدواداچوون بە شێوەی جیاواز بۆ دەکرێت، کە لەوانە نییە توێژینەوەکەی توێژینەوەیەکی زانستی بێت.
بێگومان دی سۆسێر لەو بروایەدایە، کە تاک ناتوانێت ئاڵوگۆری و گۆرانی زبان (اللغة) بکات، چونکە ئەم گۆڕانە تەنها پەیوەستە بە کۆمەڵ.

لەوانەشە ڕای جیاواز لە بارەی ئەم بڕوایەدا هەبێت، کە ئاڵوگۆڕی و گۆڕان بە توێژەرو داهێنەرو نوێکار دەستپێدەکات و ئەم توێژەرو داهێنەرو نوێکارە بریتییە لە تاکێکی دیاریکراوو کە بریتییە لە گەیشتن بە ئەنجامێکی زمانەوانی، کە کۆمەڵ پەسەندی دەکات و لێی تێدەگات. پاشان بە شێوەیەکی گشتی لە سەر تەواوی تاکەکانی ناو کۆمەڵگە بڵاودەبێتەوە، هەر بۆیە تاک بریتییە لە سەرەتای ڕاستییەکە بۆ بەکارهێنانی وزمانێکی نوێی تازە.

کۆمەڵگە ئەو نوێیەی کە بڵاودەبێتەوە، پەسەندی دەکات، بێگومان ئەوەش دەبێتە کارێکی هاوبەش و گشتی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا.

**بیروڕای یسبرسن لە سەر تیۆری دی سۆسێر**

ئۆتو یسبرسن وای دەبینێت، زمان (اللسان )،و گووتن (الکلام) دوو ڕووی یەک دراون. گووتن (الکلام) کە سەرچاوەکەی مرۆڤە یاخود لە مرۆڤەوە دەردەچێت، بریتییە لە کۆشش و کاری تاکەکەسی بەڵام تەواو نابێت، مەگەر بە ڕەگەزێکی گرنگ نەبەستیتەوە، کە ئەویش بریتییە لە ڕەگەزی تێگەیشتنی ئەوانیترو یەکەکانی هەر زمانێک بریتییە لە کۆمەڵە یەکەیەک، کە تاکەکانی کۆمەڵگە گۆی دەکات.

پەیوەندی لە نێوان گوتن (الکلام)، و زمان (اللسان) وەکو پەیوەندی تاک بە جۆر وایە. کۆمەڵە تاکێک کۆمەڵی زمانی پێکدەهێنن، بەڵام کۆمەڵە گوتنی تاکێک زمان (اللسان) پیکدەهێنن.

یسبرسن زاراوەی نوێ لە جیاتی زاراوەکانی دی سۆسیر زمان (اللسان )، و گوتن (الکلام )،و زبان (اللغة) دادەنێت، زاراوەکانی یسبرسن ئەمانەن:

١- زبانی تاک: یسبرسن وای دەبینێت، کە زبانی تاک بریتییە لە کۆمەڵێک بەهاداری زمانەوانی هەبوو بەرجەستە لە لای ئەو تاکە.

٢- زبانی کۆمەڵگە: یسبرسن وای دەبینێت، کە زبانی کۆمەڵگە بریتییە لە کۆمەڵێک بەهاداری زمانەوانی هەبوو بەرجەستە لە لای تاکەکانی کۆمەڵی زمانی ئەو کۆمەڵگەیە، واقعی زمانەوانی ئاخاوتنی زمانی پێکدەهێنێت، بەڵام پەیوەندییەکان و ڕێزمان بریتییە لە زبان (اللغة) ئەو زبانە تاکەکەسی یان کۆمەڵی دەبێت.

٣- ئاخاوتنی زمانەوانی: بریتییە لەوەی کە تاک هەڵدەستێت بە درکاندنی دەستەواژەیەکی دیاریکراو بە یەکجارو بریتییە لە دۆخێکی تاکەکەسی و بێگومان، کە لە هەڵوێستێکی تردا دووبارەی ناکاتەوە.

زۆربەی توێژەران دی کورتینی بە پێشەنگی زمانەوانیی بونیادگەری دادەنێن، دی کورتینی پاڵپشتی لە توێژینەوەکانی فۆنۆلۆجی لە قوتابخانەی زمانەوانیی کازان دەکرد، کە ئەو قوتابخانەیەی دی سۆسێر ڕێزمانی شیکردنەوەی فۆنۆلۆجی لێ وەرگرت.

دی کورتینی لە ساڵی ١٨٩٣ز توێژینەوەیەکی دەربارەی فۆنیم بڵاوکردوەو خاوەنی ئەم زاراوەیەشە.

دی سۆسێر بیروڕاکانی فەیلەسوفی فەرەنسی جان جاک ڕۆسۆی وەرگرت و لەگەڵ فێرکارییەکانی، کە لە کتێبی (گرێی کۆمەڵایەتی )دا هاتووە.

**گرنگترین ئەو زاراوەو بیروڕایانەی، کە لە تیۆری دی سۆسێردا هاتووە:**

١- بێگومان دی سۆسیر پەیوەندی نێوان زمان (اللسان)، و گوتن (الکلام)ی ڕوونکردەوە، زمان لە لای ئەو سیستەمێکە جیاوازە لەوەی کە زمان ئاراستەیەکی دووبارەکراوە بێت.

٢- زاراوەی فۆنیم: فۆنیم بریتییە لە بەرهەمی کۆتایی شێوەو چاپکراوەکانی بیستن و جوڵانەوەکانی درکاندن، و بریتییە لە کاریگەری ئاڵوگۆڕکاری یەکەکانی بیستن و یەکەکانی درکاندن، بەمپێیە بریتییە لە یەکەیەکی لێکدراو، کە ڕیشەکەی بۆ زنجیرە درکاوەکان و دواتر بۆ زنجیرە بیستراوەکانە.

٣- توێژینەوەی زانستی زمان (زمانەوانی) توێژینەوەیەکی زانستی نوێیە.

٤- توێژینەوە لە زبان (اللغة) توێژینەوەیەکی وەسفییە، پاش ئەوەی کە توێژینەوەی زبان توێژینەوەیەکی مێژوویی بوو. پاشان جیاوازی لە نێوان دینامکی (جووڵە) ی زبان و واقعی ئیستایی زبانی کرد.

٥- توێژینەوەی لە تایبەتمەندی و سیفاتی هێمای لە زبان کرد.

٦- دی سوسێر وای دادەنا، کە توێژینەوەکردن لە زبان (اللغة) توێژینەوەیەکی تەواوە.

٧- دی سۆسێر جیاوازی لە نێوان زبانی درکاو زبانی نوسراودا کرد.

**بیروڕای فێرس لە بارەی تیۆری دی سۆسێر**

فێرس وای دەبینێت، کە توێژینەوە لە زبان (اللغة) دەبێت وای دەربڕیت، کە بەشێکە لە کردەی کۆمەڵایەتی تەواو، و بێگومان گوتنی کردەیی تاک هیچ بوونێکی زهنی جیاوازی لە زمان (اللسان) دا نییە، بەڵام تاک ئەوەیە کە هاوبەشی لە زۆربەی فرمانەکان لەگەڵ کۆمەڵگەدا دەکات، و کەسایەتییەکی سەربەخۆی جیاوازە لە کەسانی تر.

پوختەی گووتن: بێگومان ئەو بیرو چەمک وزاراوانەی کە لە لای دی سۆسێر بەکارهاتوون، پێشتر لە لایەن کەسانی تر دەستاو دەستی پێکراوەو ناسراون لە زوودا.

٢- قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی پراگ:

ئەم قوتابخانە زمانەوانییە سوودی لە قوتابخانەی زمانەوانیی دی سۆسێر وەرگرت، بەڵام هەندێ لە بنچینەکانی پێشخست و لە بەناوبانگترین دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە تروبتسکی (- ١٩٣٨) و ڕۆمان یاکبسۆن (- ١٩٨٢) ن.

قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی پراگ تیۆرێکی

تەواوی بۆ شیکردنەوەی فۆنۆلۆجی دانا، ئەم تیۆرە هەڵسا بە ویناکردنێکی تایبەت بۆ فۆنیم، ئەم ویناکردنە لە دووانەکانی دی سۆسیرە، کە بریتییە لە زبان (اللغة )،و گووتن (الكلام )، کە بنچینەکانی لە زمانی زبانەکانی سلاڤیی پێکدەهێنێت.

زاناکانی ئەم قوتابخانە زمانەوانییە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو بۆ پێشکەوتنی زمانەوانی و سەرەتاکانی بونیادگەری بە شێوەیەکی ڕوون لەم قوتابخانە زمانەوانییە دەرکەوت، کە جیاواز بوو لە قوتابخانە زمانەوانییەکانی تر.

قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی پراگ گرنگی بە چۆنیەتی بەجێگەیاندنی یەکەی دەنگی بۆ ئەرکەکەی دەدا، هەر بۆیە ناویاننا (زمانەوانی ئەرکی )و دامەزرێنەرانی گرنگیان بە فۆنۆلۆجیا دەدا، بۆیە ناونرا (قوتابخانەی فۆنۆلۆجی ).

زاناکانی قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی پراگ واتایان، هەر وەکو بلومفیلد کردی، پەراوێز نەخست و جیاوازبوون بە دوورکەوتنەوە لە ڕووتاندنەوەی زبان (اللغة) و ناوەندیبوون و دادپەروەری و نەبوونی توندڕەوی.

**گریمانەکانی قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی پراگ ئەمانەن:**

١- وای دەبینێت، کە باشترین زانیاری ڕوخساری زبان (اللغة) بریتییە لە شیکردنەوەی سینکرۆنی بۆ متمانەی کردەیی.

٢- زمانەوان گرنگی بە توێژینەوەی فۆنۆلۆجی دەدات و توێژینەوەی فۆنێتیکی بۆ سیستەمی زمانەوانە.

٣- وا دەردەبڕدریت، کە زبان (اللغة) سیستەمێکی ئەرکییە، لەگەڵ ئەوەشدا زبانی بەرهەمهاتوو لە کاری زمانی( اللسان) دا، بریتییە لە سیستەمێک بۆ هۆکارەکانی دەربڕین و بە جێ گەیاندنی هەموو قسەکەرێک لە دەربڕین و گەیاندندا.

٣- قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی گلۆسیماتیکس:

ئەم قوتابخانە زمانەوانییە ناونراوە بەو ناوەی کە ڕێژەیەکی بۆ تیۆری واتاسازییە و بە گلۆسیماتیکس Glossematics ناسراوە. ئەم تیۆرە وا دەردەبریت، کە زبان شێوەی زیاتری لە مادده پێکدێت، و لە بەناوبانگترین پێشەنگانی ئەم قوتابخانە زمانەوانییە، زمانەوانی دانیمارکی (لویس هیلمسلیف )ە، کە وای دادەنێت زبان (اللغة) ڕێککەوتنێکە لە پەیوەندییەکان و چۆنیەتی ڕوونکردنەوە لێی بایەخ وگرنگییەکەی دەگۆڕێت.

**ڕەخنەی تیۆری واتاسازی**

فیرس وای دەبینیت، کە تیۆری هیلمسلیف تیۆرێکی ڕووتە، و ئەم تیۆرە تیۆرێکی لۆجیکی وەرزشیە، گەر زیدەڕۆیی خاوەنەکەی بێت لە بنەماکانی، کە دی سۆسیر بانگەشەی لە دەرچوون و لێکدانەوەو هەڵێنجان و کارەکیدا بۆ دەکرد، هەر بۆیە زیدەڕۆیی لە نووسینەکانی دی سۆسێردا سروش و ئیلهام نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا تیۆری هیلمسلیف تیۆرێکی ناوازەو لێهاتووە بە شێوەیەکی گشتگیرو فرەوان و مەوداکەی، بەڵام تیۆرەکە تاکو ئێستاکە بە شێوەیەکی تەواو لە سەر زبانێک لە زبانەکاندا جێبەجێ نەکراوە، هەر چەندە زبانی دانیمارکی بە خاوەنێتی ئەم تیۆرە دادەنرێت، و لەوانەیە ئەوەش بووبێتە سروشێکی کاری چاکە بۆی، کە ئەم تیۆرە دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێک لە بیرکاری پوخت.

٤- قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی کازان (یان بازنەی زمانەوانیی بونیادگەریی کازان):

قوتابخانەی زمانەوانیی بونیادگەریی کازان بریتییە لە کۆمەڵێک بیروڕا، کە دی کورتینی و کروشیفسکی لە وانەکانیان لە زانکۆی کازان ڕوونیان کردبووەوەو جەختیان لە سەر جیاوازی نێوان زبان (اللغة )،و گووتن (الكلام) کردەوە.

توێژینەوەکانی دی کورتینی لە زانکۆی وارسۆ لە پۆلەندا توێژینەوەکردنبوو لە سەر زبانەکانی سلاڤی و زبانی لتوانی و فسیۆلۆجیای دەنگەکان، و هەروەها گرنگی بە توێژینەوەی زمانەوانی و بیرکاری دەدا.

دی کورتینی لە ساڵی ١٨٦٨ز کتێبی (هەندێ لە دۆخەکانی پێوانە لە گەردانکردنی زبانی پۆلەندی) دانا، کە دەربارەی مێژووی زبانی پۆلەندی بوو، کە تیایدا باسی گۆڕانکاری دەنگی و گۆڕانکاری دەروونی لە زباندا کردووە، هەروەها دی کورتینی پلەی دکتۆرای لە زانکۆی بترسبۆرگ بە دەستهێنا و گرنگی بە دەنگسازی و پەیوەندی بە فسیۆلۆجیا دەدا، هەر وەکو گرنگی بە بەراوردکاری زبانەکان دەدا.

دی کورتینی توێژینەوەی لە سەر زبانەکانی ئەرمەنی و ئیستونی وعەرەبیدا کردووەو نزیکەی ٦٤٠ وتارو توێژینەوەی زمانەوانی لە سەر زۆربەی زبانەکانی ئەوروپی هەیە، کە زۆربەی زۆری قوتابییەکانی کۆیان کردۆتەوەو لەو ماوەیەدا گرنگی بە ڕێزمانی گشتی و بنچینەکانی دەروونی بۆ دیاردەکانی زمانەوانی دەدا.

دی کورتینی کۆمەڵێک وانەی لە زانکۆکانی کۆبنهاگن و پاریس پێشکەش کردووە، بەڵام نەیتوانیوە تیۆرێکی زمانەوانی تەواو دابنێت.

دی سۆسیرو کۆمەڵێک لە زاناکانی زمانەوانیی ئەوروپی کاریان لە دی کورتینی کردووەو پێیان کاریگەر بووە.

**- ئەم بابەتە لە کتێبی (دراسات في علم اللغة (٢٠١٢) صادق يوسف الدباس, الطبعة الاولى, دار الاسامة للنشر والتوزيع, الاردن, ص١٧٩- ١٨٦.) لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی.**

# دەرچوویەکی زانکۆی سەلاحەدین
# لەچەندین پێشبڕکێی تەلارسازیدا ت

**ئا:زامدار ئازاد: راگەیاندنی کۆلێژی ئەندازیاری**

قوتابیان و دەرچووانی زانکۆی سەلاحەدیندا توانیویانە لەزۆربەی پێشبڕکێ و کۆنفرانسەکاندا خۆیان بسەلمێنن بەهۆی هەموو ئەو چالاکیانەی، کە لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا ئەنجام دەدرێ بۆ ئەمەش، لارە دلێر بەشیر دەرچووی ساڵی خوێندنی ٢٠١٨-٢٠١٩ ی کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین دوای ئەوەی ئەوەی لەپێشبڕکێیەکدا بەشداری کرد و لەو پێشبڕکێیەدا لەدە یەکەمەکان بووە، زانکۆ پرێس چاوپێکەوتنێکی کورتدا سەبارەت بەو پێشبڕکێیە باسی لەوە کرد، کە ساڵانە ئەمجۆرە پێشبڕکێیە نێودەوڵەتییە لەعێراقدا سازدەکرێ لەلایەن رێکخراوی (تمیز) ئەمجارەشیان بۆ تەلارسازن بوو، ئەو گوتی «قوتابییان بەپرۆژەی دەرچوونیان بەشداری دەکەن، منیش وەک قوتابیەکی کوردستان بەشداریم کرد». باسیشی لەوە کرد کە « لەپێشبرکێیەکە (٩٠٨)قوتابی بەپرۆژەی جیا جیاو لە(١٥١) زانکۆی جیاواز(٦٤)ولاتی جیهان بەشداریان کردبوو» سەبارەت بەپێوەرەکانی بەشداریکردن ئەوەی خستە روو، کە بەگشتی پێوەرەسەرەکیەکان بۆ هەلبژاردنی (١٠)یەکەمە بریتیە لە هەبوونی داهێنان وبیرۆکەی نوێ ودەستنیشانکردنی ئەو پرۆژانەی وگۆڕانکارییەک دروست دەکەن بەجێبەجێ کردنیشیان پێداویستی و شوێنی کەلێنە








# انیویەتی خەڵات بەدەست بێنێت

ناوخۆییانە پردەکەنەوە لە ڕێگەی تێگەیشتنێکی ووردو پوختی ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی خەڵک دەبنەوە، لەلایەکی دیکەوە سەبارەت بەوەی ئایا لە پێشبڕکێی دیکەدا بەشداریت کردووە، یاخود ئەو سەرکەوتنە لەلای ئەودا چی دەگەیەنێت ئەو گوتی « بەرەو پێشچونم لەو بوارەی کە تێیدا کارام.هەر لەمنداڵیشەوە زۆرم حەز بە پێشبرکێ بووەو لەوەتەی لەبەشی تەلارسازی وەرگیراوم پێشتریش لەچەند پێشبڕکێیەکی دیکەدا بەشداریم کردبوو. لەوانە پێشبڕکێیەکی تایبەت سازکرا لەزانکۆی بەغداد، تایبەت بە پلان دانانی شار و نوێ کردنەوەی بەدیزاین کردنی شارێکی خەیالی ژینگە دۆست وکەتوانیمان خەلاتی داهێنان (جائزە الابداع) بەدەست بهێنین لەساڵی ٢٠١٧/٢٠١٨ «. جەختیشی لەوە کردەوە کە لەچەندین پێشبڕکێی دیکەدا توانیویەتی پلەی بەرز بەدەست بێنێت وەک لەپێشبڕکێیەکانی زانکۆی تیشکی نێودەوڵەتی کە لەسەر ئاستی زانکۆکانی کوردستان بوو، «هەموو ئەو سەرکەوتنانە هەستێکی تایبەتی باوەڕ بەخۆبوونی پێبەخشیووم تا زیاتر لە پێشبڕکێیەکانی دیکەدا بەشداری بکەم و پرۆژەی زیاترم هەبێ، چونکە من وەک هەر تەلارسازێک ئەوە دەبینم، کە وڵاتەکەمان لە قۆناغی گەشەسەندندایە، بۆیە هەوڵەکانم بەردەوامە تا جێگەی دەستم دیار بێ لەو گەشەسەندنە».












**پ.ی.د.ایوب سماقەیی**

# ڕەنگەکانی ئابووری

زۆر جاران ڕەنگ ئاماژەیە بۆ ناسینەوەی دۆخێک یان بوارێک لە بوارەکان، هۆکارێکە بۆ ناسینەوەی جۆری کەسەکان وتەنانەت زۆرجار ڕەنک دیاریکەری بارودۆخی دەرونیشە،زۆربەی کاتەکانیش هەندێ کار و ڕێکخراو ڕەنگێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، تەنانەت پارتی سیاسیش ڕەنگی تایبەت بە خۆی هەیە، کەواتە ڕەنگەکان دەگۆڕێن بە پێی گۆڕانی بارودۆخەکان،کارو چالاکیە ئابووریەکانیش ڕەنگی تایبەت بە خۆیان هەیە، تەنانەت جۆری ئابووری ڕەنگی تایبەت بە خۆی هەیە، لەبەر ئەوە ئەم بابەتە بۆ پۆلێنکردی ئابوورییە یان بۆ ناساندنی ئابوورییە لە ڕێگای ڕەنگەکان،لەبەر ئەوەی جۆر و شێواز و بەش و قۆناغەکانی ئابووری ڕەنگی تایبەت بە خۆیان هەیەوەک :

**١-ئابووری سوور:** بریتییە لەو ئابووریەی حکومەت هەموو بڕیارەکان خۆی دەیدات دەربارەی بەرهەمهێنان و دابەشکردن،ئەم جۆرە سیستەمە لەیەکێتی سۆڤیەتی جاران پەیڕەو دەکرا،حکومەت خاوەنی هەرە زۆری هۆکارەکانی بەرهەمهێنانە (زەوی،سەرمایە)هەروەها ئاراستەکردنی هەڵسوکەوتی دامەزراوەکانی لەزۆربەی دامەزراوەکانی بەرهەمهێنانی بەدەستە،دەوڵەت خۆی کرێکار دادەمەزرێنێت و پێشیان دەڵێت چۆن کاربکەن،بڕیار لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی بەرهەمی نەتەوەی دەدات لەسەر کاڵاو خزمەتگوزاری جۆربەجۆرەکان بەکورتی لەم سیستەمەدا حکومەت وەڵامی هەموو پرسیارە ئابوورییە سەرەکیەکان دەداتەوە لەڕێگەی خاوەندارێتی کردنی دەرامەتەکان و توانایی لەسەپاندنی بڕیارەکانی.

**٢-ئابووری قاوەیی:** بریتییە لەو ئابووریەی گەشەی ئابووریەکەی پشت بە و چالاکیانە دەبەستێت کە تێکدەری ژینگەن وژەهر دەخەنە ئاوو هەواو خاک، ئەو چالاکیانەش پشت بە وزەی وەک خەلووز و نەوت و




گازی سروشتی دەبەستن، لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو ووزانەش دەبێتە هۆی دەردان و دروست بوونی گازی دووەم ئوکسیدی کاربۆن و یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن و میسان، لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی دروست بووی دیاردەی قەتیس بوونی گەرما.وەک پیشەسازی چیمەنتۆ و پیشەزاری دروستکردنی ووزە لە نەوت و خەلووز و گازی سروشتی.زۆر جاری پێنان دەگوترێت پیشەسازیە پیسەکان.

**٣-ئابووری سپی:** بۆ یەکەم جار (پرۆفیسۆر دوجلاس ماک ویلیامز) لە سالٌ ٢٠١٥ کتێبێکی بلاوکردەوە بەناوی (الاقتصاد الابیض المسطح) لە لەندەن کتێبە باسی ئابووری سپی کرد، باسی ئەوەی کرد کە ئابووری سپی واتە ئابووری ژمارەیی کە چۆن رۆلی هەیە لە پێشخستنی لەندەن و دوارۆژی شارەکە لە خێراکردنی گەشەی ئابووری و رەخساندنی دەرفەتی کار و بەتایبەتی لە رێگەی فرۆشتن بە ئینتەرنێت. بەتایبەتی بەکارهێنانی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای زانیاری و پەیوەندیەکان و بازرگانی ئەلیکترۆنی و خوێندنی ئەلکترۆنی وخزمەتگوزاری بەنکی و مامەلەی ئیلیکترۆنی کاغەزی دارایی وەک پشک و قەوالە .

**٤-ئابووری خۆلەمیشی:** بۆ یەکەم جار زانای ئابووری (ئارسەر لویس) بەکاریهێنا بۆ ئەوچالاکیانەی خۆیان دەزنەوە لە باج دان و ئەو چالاکیانەی قازانجی گەورە بەدەست دەهێنن و دوورن لە چاودێری دەولەت، کە پێی وابوو نزیکەی ٤٠٪ بۆ٦٠٪ ی چالاکی ئابووری ولاتانی دواکەوتوو دەگرێتەوە.وەک چالاکی جامبازی لە دەرەوەی بازارە رێکخراوەکان رەشوە وەرگرتن و دەستخۆشانەی نایاسایی بۆ ئەو چالاکیانە و ناکەونە ناو ئاماری فەرمی دەولەت.بەلٌکو لە دەرەوەی چوارچیوەی یاسایی و یاسایی کار کاردەکەن بە ئاگاداری حکومەت یان بەبێ

ئاگاداری حکومەت، نە ئابووری ڕەشن وە نەئابووری سپی لەو نێوەندەن لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێت ئابووری خۆڵەمێشی.ڕێژەی لە ٣٠٪ بۆ ٥٠٪ ئابووری گشتی زۆربەی وڵاتانی عەعبی پێک دەهێنن.

**٥-ئابووری ڕەش:** ئەو چالاکییە ئابووریانە دەگرێتە کە دەکەونە دەرەوەی بازنەی یاسایی واتە چالاکیە ئابووریە نایاسایەکان، زۆر جاران پێشی دەگوترێت ئابووری سێبەر یان ئابووری نهێنی یان ئابووری شاراوە وەک بازرگانیکردن بە مرۆڤ و بەشەکانی جەستەی مرۆڤ و پارەی ساختەو پرۆگرامی دزراو وکۆپیکردنی نایاسایی و دزینی زانیاری کەسی و دارایی کەسەکان بۆ گەیشتن بە ژمارەی بەنکی کەسەکان و بازرگانی چەک و بەرهەمهێنان و دابەشکردنی مادە هۆشبەرەکان بازرگانی دەرمان و خۆراکی بەسەرچوو و دزی وسەختەکردنی بازرگانی.ئابووری ناسانی هند لە ٣٥٪ سەرجەمی بەرهەمی ناوخۆیی هندیان بە ئابووری ڕەش ناوبرد وەک لە کتێبی(تێگەیشتن لە ئابووری ڕەش و دارایی ڕەش لە هند) هاتوە کەنووسەرەکەی (ێرون کومار)ە لە ساڵی ٢٠١٧.

**٦-ئابووری سەوز:** نەتەوە یەکگرتووەکان پێیوایە ئابووری سەوز بریتییە لەو ئابوورییەی کە هەوڵدەدات جۆری ژیانی مرۆڤ باش بکات و دادی کۆمەلایەتی بەدەست بهێنێت بۆ مرۆڤ واتەگۆرینی شێوەی بەکارهێنان و بەرهەمهێنانی پچرپچر بۆ شێوازی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی بەردەوام، واتە هەوڵدەدات ڕەهەندەکانی پەرەپێدانی ئابووری بەردەوام بەدەست بهێنێت وەک ڕەهەندی ئابووری و ژینگەیی و کۆمەڵایەت و دامەزراوەیی و سیاسی.

**٧-ئابووری شین:** ئابووری شین وەک بابەتێکی ئابووری دوای سەرکەوتنی گرینگی دان بە ئابووری سەوز دەرکەوت وا دوای گەشەکردنی مانای ئابووری سەوزی پشت بەستوو بە ووزەی پاک،ئابووری شین بریتییە لە ئیدارە دانێکی گونجاو نموونەی سەرچاوەکانی ئاو لە رووبار و دەریاو زەریا کان بە شێوەیەکی بەردەوام و پارێزگاری لێکردنی لە پێناو نەوەی ئێستاو داهاتوو ئەو ناوەش بۆ ئابووری ناسی بەلجیکی(جونزپاول) دەگەرێتەوە کە ساڵی ٢٠١٢ لە کۆنگرەی ژینگەی جیهانی لە ریودیجانیرۆی لە بەرازیل بەکاری هێنا.

**٨-ئابووری بەنەوشەیی:** بریتییە لە تەواوکاری لە نێوان ئابووری و ڕۆشنبیری بۆ پێدانی بەرگێکی مرۆیی بە جیهانگیری ئابووری بۆ گونجاندنی پەرەپێدانی ئابووری و بەردەوام بوونی پەرەپێدانی ئابووری، ئەو بوارەیە گرینگی دەدات بە پەرەپێدانی ئابووری بە پەرەپێدانی ڕۆشنبیری بۆ ڕزگاربوون لە قەیرانە ئابوورییەکان و ئاراستەکردنی ئابووری بۆ دوارۆژێکی سوود بەخش و نوێ کردنەوەی چالاکی بەرهەمهێنان.ئابووری وەنەوشەیی پەیوەندی هەیە بە قیەم و ڕۆشنبیری کۆمەڵگە وەک پێداویستیەکی مرۆیی، ئەمەش وادەکات لەیەک تێگەیشتن و هەم ئاهەنگیەکی باش هەبێت لە نێوان ڕۆشنبیری و ئابووری،لەبەر ئەوەی ڕۆشنبیری یەکێکە لە تەوەرەکانی یارمەتی دەر بۆ پێشکەوتنی ئابووری و گەیشتن بە ئامانجەکانی ئابووری، ئەم ڕەنگە لە ساڵی ٢٠١١ لە ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی دەرکەوت لە مونتەدای ئابووری بەنەوشەیی لە پاریس کە لە لایەن یونیسکۆ وپەرلەمانی یەکێتی ئەورووپاوکۆمیسیونی ئەورپاوە بەسترا، لەومونتەدایە ئاماژە بەکاری وەنەوشەیی کرا وەک پلانی پەرەپێدان یان گۆرینی خانوێکی کۆن بۆ مۆزەخانە یان بەخشینی خەڵات و ڕێزلێنانی پەیوەندار بە بواری ڕۆشنبیری یان کاری ئەو دامەزراوانەی ڕۆلیان هەیە لە پێشخستنی لایەنی ڕۆشنبیری، وئاماژە بە پیشەی وەنەوشەییکرا وەک پیشەی سەرچاوە مرۆیەکان بان پیشەی بەبازارکردن و پەیوەندیەکان.

**٩-ئابووری زیویی:** بریتییە لە و ئابوریی‌ەی کە تایبەتە بەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەش دەکرێن بەو کەسانەی تەمەنیان لە ٥٠ ساڵ بەسەرەوەیە وەک یانەی ووەرزشی و یانەی دانس و نەخۆشخانە و چاودێری کۆمەلایەتی و هتد، هەموو ئەو چالاکیانە تایبەتن بە بە سالاچووەکان ناوەکەش لە ٥٠ ساڵی زیوینی تەمەنیان هاتووە.

**١٠- ئابووری زەرد:** بریتییە لە و ئابوورییەی کە چالاکیەکانی پشت دەبەستێت بە ووزەی تیشکی خۆر واتە تیشکی خۆر سەرچاوەی سەرەکی وزەیە لەو ئابوورییە ئەمەش ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە ئابووری ژینگە و وازهێنانە لەو وزانەی کە زیان بەخشن بۆ ژینگە وەک نەوت و خەلوز و گازی سروشتی واتە ئەو ئابوورییەی کەپشت بە وزەیەکی دۆستی ژینگە دەبەستێت بۆجێبەجێکردنی کارو چالاکیەکانی.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایە ئابووری هەرێمی کوردستان چەند ڕەنگی لەم ڕەنگانە تێدایە،دیارە ئابووری کوردستان زۆرێک لەم ڕەنگانەی تێدایە هەندێکیش زۆر گرینگن و دیارنیینە و نابینرێن لە ئابووری هەرێمی کوردستان، ئابووریەکی ڕەنگالەی خۆڵەمێشی ڕەش خەریکە بال دەکێشێ بەسەر ئابووری هەرێمی کوردستان لەبەر ئەوە دیاریکردنی ڕەنگێکی دیاریکراو لەو قۆناغەدا بێڕەنگیە،لەبەر ئەوەی تێکەڵکردنی چەند ڕەنگێکی تۆخ تاریکترین ڕەنگ دروست دەکات.



# کاراکتەری ئایینی - لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ کلتووری

تێزی دکتۆرایەک سەبارەت بە کاراکتەری ئایینی-لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ کلتووری لەلایەن (سالار عەبدوڵڵا ئەحمەد) ناسراو بە (سالار تاوەگۆزی) لە زانکۆی سەلاحەددین بەڕێوەچوو. تێزی دکتۆراکەی ناوبراو سەبارەت بە بابەتێکی زۆر هەستیارە لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق و ناوچەکە بەناونیشانی (کاراکتەری ئایینی - لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ کلتووریە سەبارەت بە ڕۆمانی عێراقی لە ٢٠٠٣ بۆ ٢٠١٦). ئامانجی توێژەر لە ئەم کارە ئەوەیە ڕوونیبکاتەوە کە ئایا کاراکتەری ئایینی لە دەقی ڕۆماندا چۆن نیشاندراوە ؟. هەروەها دەیەوێت نەسەقە کلتووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو جۆرە کاراکتەرە بدۆزێتەوەو قسە لەسەر لایەنە شاراوەکانی ژیانی بکات، هاوکات ئەو ئەلتەرناتیڤانەش بخاتە ڕوو کە ڕۆماننوسەکان بۆ چارەکردنی بارودۆخی خراپی عێراق لەژێر سایەی دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی و زاڵبوونیان بەسەر فەزای گشتیدا، پێشنیازیان کردووە. بایەخی لێکۆڵینەوەکە لەئەوەدایە باس لەچەند بابەتێک دەکات کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە واقیعی هەنوکەییمانەوە هەیە، وەک: توندوتیژی و تیرۆر وپرسی ئافرەت و دەسەڵات و پەیوەندی نێوان من و ئەویدیکە و پێکەوەژیان و پرسی پەراوێز و مەرکەز و کەمینە ئاینیەکان و چەند بابەتێکی دیکە، ئەویش لەڕێگەی لێکۆڵینەوە لە کاراکتەری ئایینی لە بیست و شەش ڕۆماندا لەسەر بنەمای دوو ڕێبازی ڕەخنەیی پەیوەست بەیەک، ئەوانیش: (ڕێبازی سۆسیۆلۆژی) و(ڕێبازی کلتووری)ن کە هەردووکیان وەها سەیری دەقی ئەدەبی دەکەن کەبونیادێکی کراوەیە وڕەنگدانەوەی بارودۆخی سیاسی وکۆمەڵایەتییە، لەڕێگەی دەقئاوێزانیشەوە پەیوەندی لەگەڵ چەند دەقێکی دیکەدا دروست دەکات. پلانی لێکۆڵینەوەکە لە پێشەکییەک ودەستپێک وسێ بەش وکۆتاییەک پێکدێت، هەربەشێکیش بۆ سێ تەوەر دابەش دەبێت جگە لە بەشی سێیەم نەبێت، کە لە دوو تەوەر پێکدێت. لەدەستپێکدا توێژەر چەمکی کاراکتەرو کاراکتەری ئایینی وڕێبازی لێکۆڵینەوەکەی ڕوونکردووەتەوە. لەبەشی یەکەمدا باسی لە (جۆرەکانی کاراکتەری ئایینی کردووە)، لەئەو میانەیەشدا تیشکی خستووەتە سەر کاراکتەری موسوڵمان، کاراکتەری مەسیحی، کاراکتەری جوولەکە و چەند کاراکتەرێکی دیکەی وەکو ئێزیدی و مەندائی و بەهائی و بودائی و کۆنفۆشیۆسی. لە بەشی دووەمیشدا هەڵوێستی کاراکتەری ئایینی بەرامبەر ئەویدیکەی جیاواز و دەسەڵات و ئافرەت شیکردووەتەوە. هەرچی بەشی سێیەمە لەژێر ناونیشانی (ڕەهەندەکانی کاراکتەری ئایینی) نوسراوە ولە (ڕەهەندی دەرەکی) و (ڕەهەندی ناوەکی) کاراکتەرەکان دەکۆڵێتەوە. توێژەر بەکورتی دەرئەنجامەکانی باس کردووە و پاشان لیستی ئەو سەرچاوانەی خستووەتە ڕوو کە زانیاریەکانی لێوەرگرتوون. جێگەی باسە، لێژنەی تاوتوێکردنەکە لەئەم ناوە دیارانەی دونیای ئەدەب و ڕەخنە و نوسین.



**ئیخلاس مەجید محەمەد**
قوتابی قۆناغی سێیەم بەشی پەروەردەی ئایینی
کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان- زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

# کەس لەتۆ تێناگات

**ژیان پڕە لەچەمکە دووبارەبوو و زیادبوو و بێزارکاریە کەڵەکەبووەکانی، ئەوکات و ساتانەی کە هەر چەند بیری لێدەکەیتەوە ناڕوات و تەواونابن!**

ئەوەی تۆدەتەوێت نابێت و نایەتە پێش و دروست نابێت! ڕاست دەکەیت! منیش وام! دەستم لەهەندێک شت بەردا لەکاتێکدا ئازیزترینم بوون، ئێستا! وازم لەشتانێک هێناوە کەپڕبەدڵ حەزدەکەم بەردەوام بێت لەگەڵم! بەڵام بەخاتر ئەوەی بەلانسی ژیان و بوون و دەوروبەرەکەم ڕابگرم وازم لێیانهێناوەو داومەتە دەستی قەدەر!.

یانیش بەنمونە: ئەو وردەکاریانەی تۆدەیانبینیت و ئەوانی تر نایبینن، ئەوەی تۆهەستی پێدەکەیت ئەوانی تر هەستی پێناکەن، یان گرنگی بەو شتانە نادەن کەتۆ گرنگیان پێدەدەیت، کەس لە بێدەنگ بوون، خەمباربوون، بێتاقەتی و میزاجیەتی تۆ تێناگات! پێکەنین و ئاشت بوونەوەو چونەوەبۆلایان تێناگات! ئالۆزیش نەبیت بەئالۆزدێیتە پێش چاو چونکە هاوشێوەی ئەوان نیت، زۆرشت دەکەیت و دەڵێیت لەمەبەستی باشی خۆتەوەیە، بەڵکو بەخراپ لێک دەدرێتەوە و ناخۆش بەسەرتدادەکەوێت، دەتەوێت شتێک چاک بکەیت و خراپتردەبێت لەجاران، ڕەنگە زۆرباشیش بزانن و هەستت پێبکەن، بەڵام کەس خۆییت لێبەخاوەن ناکات، چونکە هەمووان بەدەرد و ژیانی خۆیانەوە سەرقاڵن. تێکەڵی خەڵک دەبیت وایت، تێکەڵنابیت تەنهاو گۆشەگیر و وون بویت لەچاوی ئەم و ئەو، خۆشت لەخۆت بێزاردەبیت و گلەییت هەیە لەخۆت، بەڵام بامن شتێکت پێبلێم، گەر ئێمە گلەییمان لەخۆمان هەبێت، مافی ئەوەمان نیە گلەیی لەوانی تر بکەین دەزانیت؟ چونکە جارێ لەخۆمان ڕازی نین، چ بێتەوە بۆ ڕازیبوون لەوانی تر؟ لەوانەشە زۆر کەس ئێمەیان خۆش بووێت! بەڵام هیچ کەسیش لێت تێنەگات! لەکۆتاییدا لەتەنهایی خۆتدا دەمێنیتەوە. یانیش لەگەڵیان دەمێنیتەوە بەڵام بەخواستی ئەوان نەک بەخواستی خۆت و چێژوەرگرتن لێیان بەشێوازی خۆت و سروشتی خۆت.



ئەوانە و زۆریتریش...
ئەزیزم! ئەوە ژیان و بیرکردنەوە و تێڕامانی گەر نەڵێم هەموومان بگرە هی زۆربەمانە!! لۆ؟ چونکە هەریەکەو لەئاستی خۆیەوە بەوشێوەیە بیردەکاتەوە لەوی تر، هەمووان بەوشێوەیە هەست دەکەین بەرانبەر بەژیان و داهاتوو و کاتەکانمان و بونی خۆمان لەوشێوێنە. شتێکی ئاساییە، ئەوە بارودۆخە نەشازو نەگونجاوەکەی ژیانمانە کەبەسەرمانداديت. بەڵام ئایا من و تۆ و هەمووان دەبێت دەستەوئەژنۆ لێی دابنیشین و تەواو؟ ئیتر هەمومان گەییشتینە ڕادەی بێزاری و بێ هیوایی و ناحەزی لەژیان و وازلەهەمووشت بهێنین؟ نــا، هەرگیز! هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژە و پێش دەرگاداخراوەکانت گوڵڕێژبکەو هەوڵ بۆدروست کردن و کردنەوەی دەرگای نوێ بدە بۆژیان و داهاتووت، بەواتای ناسینی کەسانی نوێ و هەڵبژاردنی شوێنی نوێ بۆمانەوە و کار و بیرکردنەوەی نوێ ...هتد. ئەوەی خۆت بۆخۆتی دەکەیت هەرگیز هیچ کەس بۆتی ناکات، چونکە خۆت لەناو مێشکی خۆتدا دەخولێیتەوە، دڵنیابە تا ساڵێکی تر ئەوکاتە هەموو هێزی دونیا هەوڵبدات لەبێزاری و نیگەرانی و دڵەڕاوکێدا دەرتبهێنێت ناتوانن! چونکە لەناو مێشک و ناخی تۆدا ناژین، نازانن تۆ هەست بەچی دەکەیت و چیت دەوێت لەخۆت و لەدەوروبەرەکەت، تۆخۆت لەهەرهەمووکەسێک گرینگتریت، لەهەمووکەسێک لەپێشتریت بۆخۆت بۆتێگەییشتن لەخۆت، خۆت کارەکانی خۆت ڕایی بکە و بینوسەوە و خاڵبەندی بکە و پلانی بۆدابنێ و دەریبڕە و ئەنجامیان بدە! باکاتێکی زۆریش بخایەنێت، خۆتۆ هەمیشە لەنوێبونەوە و هەوڵداندایت، ئەوەش خودی بونیادنانی کەسێتی و ژیانی تاکەکەسیتە، هەرگیز نەکەی بتەوێت لەماوەی مانگێک سەرتاپا هەمووژیانت بگۆڕێت، نا! نەکەیت خۆت توشی نارەحەتی و پەشۆکاوی و تێکچونی دەرونی بکەیت!چون بەدەستهێنانی دەستکەوتی گرینگ قوربانیدان و کاتی گرینگی دەوێت، توانا و خۆشنودیەکی زۆری دەوێت، بزانە! ئەوەی هەوڵی بۆدەدەیت و ماندوودەبیت (ئامانجەکانتە.) بۆیە ئاساییە قوربانیەکی زۆری بۆبدەیت و شیرینی ئێستات تاڵبکەیت لەپێناو شیرینیە هەمیشەییەکەی داهاتووت، کەدروست کردن و خۆگونجاندنی خودی خۆتە لەناو کۆمەڵگە و خێزان و وڵات و بەرلەهەمووشتێک ئاسودەیی ناخی خۆتە!



**د. مەولود ئیبراهیم حەسەن**

# خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەو وەرگێڕانی زانکۆی سەلاحەدین!!

خۆشەویستان.. ..کارمەند و قوتابی و مامۆستایانی زانکۆی سەلاحەدین..تا ئێستا نەتۆو نەمن لە هیچ جێگایەک ئەم ناونیشانەمان بەرچاو ناکەوێ ! بەڵام، من ..دەزانم تۆش وەک ومن هیواداری ڕۆژێ ئەم ناونیشانە بەسەر باڵەخانەیەکی بەرزوجوان بخوێنیتەوە، کە بە تابلۆیەکی جوان و گەورە لە شووێنێکی شیاو هەڵواسرابێ، نەک هە ر ئەوەندە ..بەلکو مانگانەو ساڵانە بەرهە می چاپکراوو وەرگێڕدرای ئەم دەزگایەلە بازاڕو پێشانگا ڕۆشنبیریی و ئەدەبی و ئەکادیمیەکان دا ببێنین ئاڕمی تایبەتی زانکۆی سەلاحەدینیشیان بەسەرەو بێت و بڵاو بکرێنەوە .

ئەوەندەی بیستوومانەو بینیومانەو خوێندوومانەتەوە (خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەو وەرگێڕان) بە ناوی جیاجیاو بە ئەرکی وەک یەک لە پێکهاتەی هە موو زانکۆیەک دا هە یە ، ساڵانە ئەم ئەم دەزگایە لێکۆڵینەوەو نامە ئەکادیمیە ئاست بەرزەکان بەشێوەیەکی جوان چاپ دەکات و هەندێکیان وەردەگێڕێتە سەر زمانە زیندووەکانی جیهان و هاو بەشیی پێشانگا گەورەو گرنگەکانی جیهانی پێ دەکات و بەرهە می لێکۆڵەرانی خۆی بە دنیادا بڵاو دەکاتەوە. چۆن ئەگەر زانکۆ بیەوەێ مێژوو و جوگرافیاو کلتورو زانست و ئەدەبی خۆی بە دنیا بناسێنێ، ئەو بێ شک دبێ پەنا بۆ بەرهە می لێکۆڵەرانی خۆی ببات و هانی لێکۆڵەرانی خۆی بدات ، کاری شیاو ئەوەیە لێکۆڵەرانی خۆمان لێکۆڵینەوە لە سەر تەواوی کلتوری خۆمان بکەن،

بەم کارەش لە چەند ڕوویەکەوە سود بە وڵات و خەلکەکەی دەگەیێنێ:

یەکەم: ئەم کارە هاندان و دەستگرتنێکی زانستییانەیە بۆ لێکۆڵەرانی خۆی و وایان لێدەکات پەرە بە ئاستی زانستی خۆیان و زانکۆو وڵاتەکەیان بدەن.

دووەم : بەم بەرهە مانە زانكۆ هاو بەشێ کۆنفرانس و پیشانگا زانستی و ئەدەبیەکان دەکات و دەتوانێ پەیوەندی کلتوری و ئەکادیمی  لە گەڵ زۆر نێوەندی ئەدەبی و ئەکادیمی پەیدابک.

سێیەم : بەم کتێب چاپکردن و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەیە، زانکۆ دەتوانێ دەرگایەکی تری ئابووری بۆ خۆی بکاتەوەویارمەتیەکیش بێت بۆ لێکۆڵەران و دەرگای کاری جۆراو جۆر بە ڕووی زۆر هاوڵاتی دەکاتەوە دەیانخاتە سەرکار.

بەداخەوە تا ئێستا ساڵانە چەندین پیشانگای گەوەرو بچووک لە ناو خۆو دەرەوە دەکرتێنەوە، زانکۆی سەلاحەدین کۆنترین زانکۆی کوردستان لەو چالاکی و نێوەندانە بێ بەرهە مە ! ا ئێستا لە هە ولێرو لەمەو دوا لە سلیمانیش ساڵانە پیشانگای نێو دەوڵەتی دەکرێنەوە، زۆر بە پێویستی دەزانم، زانکۆی سەلاحەدین و هەموو زانکۆکانی کوردستان خۆ بۆ ئەم چالاکیە زانستی و ڕۆشنبیرییە ئامادەبکەن و لەمەو دوا بە بەرهە می زۆرو شیاو ی خۆیان جێگای شایستەی بە خۆیان پەیدا بکەن و سەردەمانە خۆ بدنە ناسین.

زانکۆی سەلاحەدین چاپخانەیەکی چاک و کادیری چاپخانەی زۆر شارەزای هەیە، کە دەتوانن بازاڕی چاپکردنی ئەکادیمی گەرم بکەن و مامۆستاو لێکۆڵەرانی زانکۆ لە خەمی چاپکردن و بڵاو کردنەوەی کتێب و لێکۆڵینەوەکانیان بێ خەم بکەن.



# زانکۆ گەورەکانی جیهان

**زانکۆی کمبریدج-شانشینی یەکگرتوو-بەریتانیا**

زانکۆی کمبریدج-شانشینی یەکگرتوو-بەریتانیا بەیەکێک لە زانکۆ دێرینەکانی بەریتانیا و جیهان دەژمێردرێ، بەیەکێک لەو زانکۆیانە دەژمێردرێ، کە لەرووی بەرزی ئاستی زانستی جیایە لەهەموو زانکۆکانی جیهان.

**زانکۆی هارڤارد-ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا**

زانکۆی هارڤاردلە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بەیەکێک لەزانکۆ بەناوبانگەکانی جیهان دەدانرێ بەهۆی فراوانی سیستەمی کتێبخانەکەی، هەروا هارڤارد بەکۆنترین زانکۆی ئەمریکی دەژمێردرێ، هەروەها زۆرترین کۆمەڵە کتێبی هەیە لەجیهاندا.

**پەیمانگەی ماساتشوسیتس بۆ تەکنەلۆژیا-ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا**

پەیمانگەی ماساتشوسیتس بۆ تەکنەلۆژیا لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەم پەیمانگەیە دەکەوێتە سەر رووباری چارلز لەناوەراستی شاری بۆستن، لەو زانکۆیانەیە، کە گرنگییەکی زۆر بە توێژینەوەی زانستی و تەکنەلۆژی دەدا لەسەر ئاستی جیهاندا.

**زانکۆی یێل —ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا**

زانکۆی ییل دەکەوێتە ولایەتی کۆنیکتت، یەکێکە لەو زانکۆیانەی بەناوبانگە لە خستنە رووی دراما و میوزیک، جگە لەوەی کۆمەڵێک قوتابی ئەو زانکۆیە بەنهێنی کۆمەڵەیەکیان هەیە بەناوی «ئێسک و بربرە».





**زانکۆی ئۆکسفۆرد-وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا**
زانکۆی ئۆکسفۆرد بەیەکێک لەو زانکۆ دێرینانە دەژمێردرێ، کە لەسەر ئاستی جیهاندا بەزمانی ئینگلیزییە، هاوکات بۆ ماوەی نۆ سەدەیە ئەو زانکۆیە لەکاردایە.
**ئەمبریال کۆلیدج لەندەن-شانشینی یەکگرتووی بەریتانیا**
ئەمبریال کۆلیدج لەندەن زیاتر لە ٣٠٠٠ ئەکادیمی و توێژەر هەیە، جگە لەوەی ١٤ هەزار قوتابی لەخۆ دەگرێ، کە لە ١٢٠ دەوڵەتی جیاجیادا هاتوون بۆ خوێندن.
**کۆلیژی لەندەنی زانکۆیی**
خوێندن لەکۆلیژی لەندەنی زانکۆیی پشت بە توێژینەوەکان دەبەستێ، بەو واتایەی پرۆگرامە پێشکەشکراوەکان خۆی لەنوێترین توێژینەوە دەبینێتەوە، کە لەلایەن ئەکادیمییە باڵاکاندا وانە دەگوترێتەوە.

**زانکۆی شیکاگۆ-وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**
لە ساڵی ١٨٩٢ دامەزراوە و دەکەوێتە هاید پارک لە شیکاگۆ، هاوکات ژیانی زانکۆیی لەوێدا بەباڵایی دەژمێردرێ، بەتایبەت لەو شارە گەورەیەدا.
**زانکۆی بنسلفانیا-وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**
زانکۆی بنسلفانیا لە فیلادلفیایە، لەلایەن بنجامین فرانکلینەوە دامەزراوە، بەیەکێک لەزانکۆ پێشکەوتووەکان دەژمێردرێ لەسەر ئاستی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و جیهان.
**زانکۆی کۆلۆمبیا-وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**
لەنێوەندی شاری نیۆریۆرکە، بەکۆنترین پەیمانگەی خوێندنی باڵا دەژمێردرێ لەوڵایەتی نیۆریۆکدا.







**پ.د.رەفیق شوانی**
بەشی کوردی کۆلێجی زمان

# شوێنی جوگرافی زمانی کوردی «کوردە وڵاتەکەت بناسە»

زمانی کوردی،زمانی سەربەخۆی نەتەوەی کوردە،لە وڵات و مەفتەنی کوردەواری بەکاردەهێنرێت،ئەم زمانە رەگ و ریشەو رەچەڵەکی دەچێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش زانین،مێژووی دیارودێرینی کە لەبەر دەست و لە مێژووی کۆندا دیارە،سەردەمی سۆمەریەکان پێشینانی کوردی ئەم رۆژگارەن،دەکەوێتە نێوان هەزارەی پێنجەم و نیوەی دووەمی هەزارەی پێش زایین

زمانی کوردی لەرووی وشەسازی و رستە سازیەوەدەچێتەوە سەر زمانی سۆمەریەکان وزمانێکی زاگرۆزیی باکوری رۆژئاواییە

سنووری زمانی کوردی:

دەکەوێتە سەر هێلی پانی باکور نێوان ٣٩-٣٤ وهێلی درێژی رۆژهەڵات٤٦-٣٧،بەشی زۆری زەوی کوردستان شاخاوییە و کوێستانە،بەشێکی کەمتری گەرمیانە و گەرمە سێرە،سنورەکەی لای باکورەوەباشوری ئەرمەنستان وئازەربایجان واتە ناگۆرنی دەباغ باکوری ئاوی ئاراسە هەر لە باکورەوە بە درێژایی ئەرزە روم تەواو دەبێ لە باشورەوە دەگاتە خواروی ریزە چیای زاگرۆز چیای پشتکۆ لە رۆژهەڵاتی کەنداو لە شوێنێک بە ناوی بەندەر دەیلەم لە رۆژئاواشەوە بانی ئەنادۆڵ لە رۆژهەڵاتیشەوە بانی ئێران شوێنی جوگرافی زمانی کوردی بە پیلانی نێودەوڵەتی و بەهۆی بەرژەوەندی سیاسی وچاو چنۆکیەوە،لە یەکتر دابرێنراوە دابەش کراوەتە سەر دەوڵەتی ئێران_ئێراق_ تورکیا_سوریا ئەمە بێجگە لە چەندین وڵاتی ئەرمەنستان، ئازەربایجان،قەرغستان،تورکمانستان،کازاخستان،ئۆزبەگستان وجۆرجیا زمان و کلتوری کوردیان لە یەکتر دابری بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٩١ ەوە تا رادەیەک ئەو قاوغەستەمکارانەیە شکێنراو کۆمەڵەی زمانی کوردی لە رووی لە یەکتر تێگەیشتنەوە پێکهاتوە لە

کوردی رۆژهەڵات:کەوتۆتە باشوری ئێرانەوە وەک لورستان،ئیلام،کرمانشا و ماهیدەشت،سنەومهاباد،خۆی و ماکۆ باکوری دەریاچەی ورمێ بڵاو بونەتەوە بێجگە لە چەند شوێنێکی تری ئێران کورد و کوردی زمان هەن وەکو ئەو بەشەی لە ناحیەی دیلمان لە باکوری قەزوێن و کرانەی

راست رووباری سپی هەردوو رووباری شارود، هەروەها لە ناوچەی کەلون عەبدو فارس – باکوری رۆژئاوای شیراز و باکوری رۆژئاوای لورستان نێوان روباری کەرخەوسنوری ئێران ئێراق وە بەشێکی باکوری رۆژهەڵاتی بلوجستانی ئێران بێجگە لەم شوێنانە کۆمەڵێک کوردی زمان ژمارەیان دەگاتە نێوان (٢٠٠-٣٠٠)هەزار کەس، لە باکوری خۆراسان دەوروبەری فیشخابور و بجنورد و شێروان و قۆچان بە درێژایی سنوری ئێران و شورەوی جێنشین بونە، ئەم ئامارە لەسەرچاوەیەکی کۆنی ساڵی ١٩٢٧ ەوە وەرگیراوە کتێبەکەش ساڵی ١٩٧٩ یە،بۆیە ئێستا ژمارەی کوردی خۆراسان لەسەروی ملیۆنەوەیە، چونکە زۆربەی نوسەرانی فارس،تورک وعرب ژمارەی کورد بەکەمی لەقەڵەم ئەدەن ئەم کوردانە چەند هۆزێکی کوردن لە لایەن شا عەباسی یەکەمەوە لەنێوان ساڵی ١٥٨٧-١٦٢٨ ز بۆ بەرگری کردن و رووبە روو بونەوەی هێرشی هۆزە تورکەکان بۆ سنووری باکوری خۆراسان کۆچیان پێکرابوو دواتریش لە سەردەمی دەسەڵاتی نادرشا ١٧٣٦-١٧٤٧ هەندێ هۆزی کورد بۆ ئەم ناوچەیە گوازرابوونەوە

باکوری کوردستان: لە لای تورکیاوە کوردانی دەشتاییەکانی ئەرمەنستان و بەشی سەرەوەی نێوان هەردوو روباری جزیرە و ناوچەکانی دەورو بەریان جێگیر کراون.لە بەشێک لە سنووری تورکیا و سوریاولە بەشی سەروی روباری دیجلە و لقەکانی لە تەرەف بۆتان و زێی گەورە و فورات (لقی مورادچای) زۆربەی خەڵکەکەی بە زمانی کوردی قسە دەکەن .ئەمە بێجگە لە شارەکانی ئورفە،ئامە د،ئەلازیز،بەدلیس،ماردین،وان وتەتوان.ناوچەی تری وەک سێرت وجولەمێرگ،بایەزیدوئاگری.شارەکانی تری وەکو مەرعەش،فارس و ئەردەهان هەرچەند کورد لەم ناوچانە بەتایبەت ئەردەهان کەمبۆتەوە،لە ساڵی ١٩١٥ لە لایەن دەسەڵاتی رەگەزپەرستی تورکیا قەتڵ و عام کران بەرەو ئەرمەنستان کۆچیان کرد.

لە باکوری کوردستان ناوچەی خەریوت، دەرسیم و بنگول و باشوری ئامەد بە کوردی زازاکی قسە دەکەن شوێنی تر ئەرزنجان و مەلاتیە و ئورفە لە ٥٠٪ و لە فارس و ئەرزەروم لە ٢٥٪ ی کۆی دانیشتوانیان بە کوردی قسە دەکەن.لە ناوچەکانی تریش لە لای تورکیاوە کوردهەن.لە رۆژهەڵاتی سێواس وباشوری ئوماسیەولە باشوری ئەنکەرە وەکو ناوچەکانی ئەمیردات و هایمانا و کوچخی سار و جەڵگەی کۆنیا، لە ناوچەکانی تر مەڵبەندی ئاناتۆلی کورد هەن، کە تورکیا لە جەنگی یەکەمی جیهانیا و دواتر شۆرشی نێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠ کە دەستی پێکرد کوردیان بۆ ئەم ناوچانە کۆچ پێکرد

کوردی باشوور:لە لای ئێراقەوە لە تەواوی سنوری لەگەڵ ئێران و تەرکیا و سوریا بە رێگەی دیجلەو لقەکانی چەپی وەک زێی گەورە و بچوک هەن وەکو : موسڵ،کەرکوک،هەولێر،سلێمانی، دهۆک وناوچە کانیان و ناوچەی چیای شەنگار کوردنشینن.ئەمە بێجگە لە ناوچەی بەدرە،جەسان،عەلی غەربی،عەلی شەرقی لە پارێزگای کوت و دیالە.

رۆژئاوای کوردستان:بە گشتی کورد لە بەشی باکوری رۆژهەڵاتی سوریا لە سنوری تورکیا و ئێراق و دەوروبەری جزیرە و قامشلی و شوێنی تری وەک باکوری حەلەب و شام (دیمەشق)کورد جێنشینن.

کورد لە ئەرمەنستان:بەزۆری لە ناوچەی باشوری چیای پمیک و رۆژئاوای دەریاچەی سیڤان(سوان-سیوان)،لە ئەچیمیادزین وئەشتەرک و نوربایازت وئەلەگەز.

لە ئازەربایجانیش: کوێستانی باشوری رۆژئاوای وەکو تەلباجار،لاچین،شوشە و قوباتلی.کورد لە ئازربایجان و ئەرمەنستان و پێش ساڵی ١٩٩١ نەماون و کوردە ئێزیدییەکانی هەردوو لا چونەتە ئەرمەنستان و کوردە موسڵمانەکانیش لە ئازربایجانن.

لە گورجستان:لە تفلیس و چەند شوێنێکی تر هەن ژمارەیەکی کەمیش لە تورکمانستان لە ناوچە سنوریەکان لەگەڵ ئێرانا هەن وەکو فەیروزە لە باشوری ئەشق ئاباد ژیان دەگوزەرێنن و گروپێکیانیش لە خۆراسانەوە هاتوتەوە ئەوێ و بەزاری کرمانجی قسە دەکەن .

بەشێکی زۆری کوردی شوورەوی لە دوای ١٩٩١ ەوە لە ناوچەی (کراسنەدار)ی دەوروبەری روسیا کۆبونەتەوە و تاکەی میللەتی زیانبەخش و زەرەرمەندی ئەو وڵاتەن لە جیاتی سەربەخۆیان لە ناو میلەتانی تری کۆمارە سەربەخۆکان پەرش و بڵاو بونەتەوە . هەرچەندە مستەفاباکیم لە ١٩٩١ داوای سەربەخۆیی و زیندوکردنەوەی کۆماری کوردستانی سوری کرد،بەڵام سەد حەیف و مخابن بێ پشتیوان و بیچ کەس بوو هیچی پێنەکرا و پەنابەری لە وڵاتی ئیتالیا وەرگرت و لەم ساڵانەی دواییدا کۆچی دوایی کرد سڵاو لە گۆری غەریبی .

لە ئەفغانستان و پاکستان:ژمارەیەک کورد هەن لە ناوچەی سیستان و بلوجستانی ئێران و ناوچەی جۆلانی ئەفغانستان دەوری شانزە هەزار کورد هەن .ئەوانەی ئەفغانستان سەرکردەو دەمسپیان عەبدولرەحمان پاشایە ساڵی ١٩٩٤ سەری لە ئەنجومەنی وەزیران و پەرلەمانی کوردستاندا .

لە باشوری یەمەنیش هۆزیکی کورد هەن .

کوردی شوانکارە : لە سەردەمی مێژووی ناوەراستی سەدەی شەشەمی زاینیدا ناویان هاتووە و پێنج سەد ساڵ خاوەن میرنشینێکی گەورەوبەهێز بوونە.سەرکردەکەیان ئەردە شێرپایکە،

کورد لە شوێنی تر: کوردی زمان لە ناوچەی جەبەل لە لوبنان هەن،کوردی حەبوشی لە ئیسرائیل رەوەندێک پێکدێنن لە ئەردەن و میسر بەتایبەت لە پارێزگای (الشرقیە) هەن لە دوای ساڵی ١٩٩١ ەوە کوردیکی زۆر کەوتوونەتە وڵاتی ئەوروپا و ئەمریکا و کەنەداوە .بەداخەوە تاکو ئێستا نەمانتوانیوە لۆبیەکی بەهێز پێکبێنین.




**پ.ی.د. محمد عزیز سعید**

کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی


# فیزیای ڕووناکی و فیزیای تەنی ڕەش

**فیزیای ڕووناکی:**

فیزیای ڕووناکی بەشێکە لە زانستی فیزیا کە پەیوەستە بە دراسەو شیکردنەوەی ڕووناکی ( تیشک). ڕووناکی واتا تیشک جۆرێکە لە جۆرەکانی ووزە. ووزە دەتوانری لە خالێکەوە بگوازرێتەوە بۆ خالێکی تر بە ڕێگای جوولەی تەنۆلکەکان یان بە ڕێگای جوولە شەپۆل. خەسلەتەکانی ڕووناکی لە ماوەی سێ هەزار سالی ڕابردوودا بە شەش بیرۆکە (تیۆری) دا تێ پەڕیووە. تیۆری دەست لێدان( هەست پێ کردن) و تیۆری تیشک دانەوە و تیۆری تەنۆلکەکانی نیوتن و تیۆری شەپۆل(ماکسوێل) و تیۆری کارۆ موگناتیس و تیۆری کوانتەم( ئەنشتاین – پلانک).

تیۆری هەست پێکردن لە سەر بنەمای توانست بو دەست لێ دان دانراوە.ئەم تیۆریە دەلی چاو سیگنالٚ دەنێری و بۆ مەستی هەست کردن بە تەنەکانی دەورو پشتمان.

تیۆری تیشک دانەوە پێچەوانەی تیۆری دەست لێ دانە و دەلێ تەنەکانی دەوروپشتمان تەنۆکەکان دەنێرن بۆ ناو چاومان و هەست بە تەنەکان دەکەین. تیۆری تیشک دانەوە لە سەرەتای سەدەی یازدەهەم لە لایەن زاناکانەوە پەسند کرا.

تێۆری نیوتن دەلێ ڕووناکی پێکهاتووە لە تەنۆلکەکان لە سەر شێوەی تۆپی زۆر بچووک. ئەم تۆپە زۆر بچووکانە لە تەنەکان دەردەچن و بەدەوروپشتمان دا بلاو دەبنەوە. تیۆری نیوتن تەنها توانی دیاردەی دانەوە و شکانەوە بسەلمێنێ و نەی توانی دیاردەکانی لادانا و چوونە ناویەک و جەمسەرگیری ڕووناکی بسەلمێنێ.

تیۆری شەپۆل لە لایەن زانا ماکسوێل داڕێژراوە و دەلێ ڕووناکی وەکوو شەپۆل هەلس و کەوت دەکات. تیۆری شەپۆل زۆر بە سەرکەوتوانە دیاردەکانی دانەوە و شکانەوەو لادانان و چوونەناویەک و جەمسەرگیری رووناکی سەلماند. بەلام نەیتوانی دیاردەی کاری کارۆ ڕووناکی یان دانەوەی تیشک لە لایەن تەنە بریقەدارەکانەوە بسەلمێنێ.

تیۆری کوانتەم هەرچەندە کەم و کوڕی تێدایە بەلام بە سەرکەوتووترین تیۆری هەژمارکراوە و دەلی ڕووناکی دووخەسلەتی هەیە (خەسلەتی شەپۆل و خەسلەتی تەنولکەکان). کاتێک ڕووناکی بە بۆشاییدا یان بە ناو مادەدا دەڕوات ئەوا وەک شەپۆل هەلسوکەوت دەکات و کاتێک دانەوەو مژینی تیشک ڕوودەدات ئەوا وەکوو تەنۆلکە هەلسوکەوت دەکات و ناوی لێ نراوە فۆتۆن. لە سالی ١٨٠١ تۆماس یۆنک سەلماندی کە ڕووناکی دەرئەنجامی کاری شەپۆلە. جۆن ئەنگسترۆم درێژی شەپۆلەکانی هەژمار کردن و سەلماندی کە هەر ڕەنگێک لە ڕەنگەکانی ڕووناکی درێژەشەپۆلی تایبەت بە خۆی هەیە. درێژەشەپۆلی ڕەنگەکانی ڕووناکی چوار هەزار ئەنگسترۆم تاوەکوو حەوت هەزار ئەنگسترۆمە. لە سالی ١٨٦٥ ماکسوێل سەلماندی کە ڕووناکی بریتیە لە بەشێک







لە شەبەنگی کارۆموگناتیسی. لە ساڵی ١٩٠٠ ئەنشتاین و ماکس پلانک سەلماندیان کە ڕووناکی خەسڵەتی دوانی هەیە ( شەپۆل و تەنۆلکە).
ئامانج لە دراسە و شیکردنەوەی ڕووناکی بۆ زانینن و تێگەیشتن لە شەبەنگی تیشکی تەنی ڕەش بوو.

**فیزیای تەنی ڕەش:**

ئینساکلۆپیدیای بەریتانی و زانایانی فیزیا پێناسەی تەنی ڕەش دەکەن بەوەی بریتیە لە تەنێکی گریمان کراو کە توانای دانەوەی زۆرترین وزەی هەیە لە هەموو درێژە شەپۆلەکانی تیشک بە هەموو ئاراستەیەکدا و توانای مژینی هەموو درێژە شەپۆلەکانی ڕووناکی (تیشک) هەیە کە لە هەموو ئاراستەکانەوە بکەوێتە سەری. ئەو وزە تیشکەی تەنی ڕەش دەی داتەوە تەنهاو تەنها بە زانی پلەی گەرمی ئەو تەنە ڕەشە دەتوانری حساب بکرێ.

بیرۆکەی تەنی ڕەش لە ساڵی ١٨٠٠ سەری هەڵداو بە بەرزترین دەست کەوتی زانستی فیزیا هەژمار دەکرێ و لە سەرەتای دەست پێکردنی فیزیا تاوەکوو ئەمڕۆ بوەتە هۆکاری هەموو دۆزینەوەکان و دەستکەوتەکانی فیزیا. زانستی فیزیای تەنی ڕەش تاکە زانستە کە تاوەکو ئەمڕۆ توانیویەتی هەموو دیاردەکانی فیزیا ڕوون بکاتەوە و بیچەسپێنی و تەفسیری بۆ دانێ.

هەموو شتێک لە سروشت و گەردوون دا بە تەنی ڕەش دانراوە و کە لە ڕواڵەتدا بوونی نیە و بەڵکو تەنها گریمانە . هەموو بنەماو یاساکانی لێکۆینەوەی پێکهاتەو دروست بوونی گەردوون لەسەر گریمانی تەنی ڕەش دارشتراوە. شەبەنکی تیشکی تەنی ڕەش تاوەکوو ئەمڕۆ تاکە بەڵگەیە بۆ ڕاستی و دروستی بیرۆکەی بیگ بانگی ( تەقینەوە زەبەلاحەکەی) گەردوون .

زانستی فیزیا چوار یاسای زۆر گرنگی پێشکەش کردوە تایبەتن بە دانەوەی تیشکی تەنی ڕەش. ئەم چوار یاسایەش لە لایەن زانایان ماکس پلانک و جۆزیف ستیفان و ئەدوارد بولتزمان و فرانزڤین و ڕۆبرت کیرشهوف دانراون.

یاسای پلانک بۆ تیشک دانەوە دەڵی شەبەنگی دانەوەی وزە توانی هەموو تەنێکی ڕەش دەتوانرێ بە زانینی درێژە شەپۆل ( لەرەلەر) و پلەی گەرمی ئەو تەنەڕەشە حساب بکرێ.

یاسای ستیفان – بۆڵتزمان دەڵی کۆی گشتی دانەوەی وزە توانی تەنی ڕەش لە یەکەی ڕووبەرو یەکەی کاتدا هەمیشە ڕاستەوانە دەبێت لەگەڵ توان چواری پلەی گەرمی ئەو تەنە ڕەشە.

گرنگی و مەزنی یاسای پلانک و ستیفان بۆڵتزمان لەوە دایە کە یاسای پلانک وزە توان حساب دەکات بۆ هەر درێژە شەبۆلێک بۆ پلەیەکی گەرمی دیاری کراو. بەڵام







یاسای ستیفان - بۆڵتزمان کۆی دانەوی وزە توان حساب دەکات بۆ پلەیەکی گەرمی دیاری کراو. بە واتایەکی تر یاسای پلانک بریتیە لە داتاشراوی یاسای ستیفان – بۆڵتزمان یان یاسای ستیفان – بۆڵتزمان بریتیە لە تەواو کاری یاسای پلانک.

یاسای ڤین بۆ لادان دەڵی جارانی درێژەشەپۆلی گەورەترین و لووتکەی تیشک دانەوە لەگەڵ پلەی گەرمی تەنی ڕەش هەمیشە برێکی نەگۆرە. واتا تەنها بەزانینی پلەی گەرمی تەنی ڕەش دەتوانری زورترین دانەوەی وزەکەی حساب بکرێ.

یاسای کیرشهۆف بۆ تەنی ڕەش دەڵی ئەو مادانەی مژەری بەهێزن هەروەها دانەوەی بەهێز دەبن. لەکاتی هاوسەنگی گەرمی دا هاوکۆلکەی مژین یەکسان دەبێت بە هاوکۆلکەی دانەوە واتا تیشکی دانەوە یەکسانە بە تیشکی مژراو.

یاساکانی فیزیای تەنی ڕەش سێ خەسڵەتی زۆر گرنکی شەبەنگی تەنی ڕەشیان دیاری کردوە. ئەم خەسڵەتانەش بریتین لەوەی گە تاوەکو پلەی گەرمی تەنی ڕەش زۆرتر بێت توانی دانەوی زۆرتر دەبێت و زۆری دانەوەی وزە پێچەوانە دەبێت لە گەڵ درێژە شەپۆلەکان و لووتکەی

# یەکەمین کۆنگرەی نێودەوڵەتی هاوبەش بۆ زانستە پەروەردەیی و دەروونییەکان سازکرا




بەچاودێری وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، بەئامادەبوونی پ.د.ئەحمەد ئەنوەر دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین، ژمارەیەک لە ئەندام پەرلەمان و نوێنەرانی وەزارەتەکان و بەرپرسی حزبی، یەکەمین کۆنگرەی نێودەولەتی هاوبەش بۆ زانستە پەروەردەیی و دەروونی لەهۆڵی کۆچەر بیرکاری سەنتەری رۆشنبیری زانکۆ سازدرا، ئەمەو لەسەرەتادا خولەکێک وەستان بەمارشی کوردستانی و عێراقی، لەپاشاندا چەندین وتار خوێندرایەوە ئەمەو راگری کۆلیژی پەروەردە لەسەرەتادا باسی لەگرنگی ئەو کۆنگرەیە کرد، کە بەهاوبەشی سەنتەری توێژینەوە و راوێژکاری لەندن بەرێوە دەچێ، هەروا جەختی لەوە کردەوە ئەم کۆنگرەیە هەنگاوێک دەبێ بۆ دووبارە پیاچوونەوە بەپرۆگرامە پەروەردەیەکان تا بەرەو ئاستێکی بەرزتر هەنگاو بنێ، لەتەک ئەمەشدا ئەو خاڵانەشی خستە روو کە پەیوەستن بە دەروونناسی.

هەر لەوێدا پ.د.ئەحمەد ئەنوەر دزەیی وتارێکی پێشکەشکرد و هیوای خواست لەم کۆنگرەیەدا پیاچوونەوە بەهەموو پرۆگرامەکان بکرێ بەبەراورد لەگەڵ هەموو ئاستەکانی زانستی و پەروەردەیی وڵاتانی جیهان بەتایبەتیش وڵاتانی رۆژئاوا.

لەپاشاندا وتاری نوێنەری وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی خوێندرایەوە.

هاوکات وتاری بەرێوەبەری کۆنفرانس و نوێنەری سەنتەری توێژینەوەی راوێژکارییە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەن د.وەلید بابان خوێندرایەوە تیایدا گرنگی کۆنفرانسەکەی لەچەند خاڵێکدا چرکردەوە وەک گەڕان بەدوای چۆنیەتی کۆنترۆڵکردنی ئەو گرفتانەی لەدەرئەنجامی ئایدیای گرووپە توندئاژووەکان دەرکەوتوون، هەروا ئاراستەکردنی توێژەران وشارەزایان بۆ گرنگیدان بەبابەت و کێشە هەنووکەییەکانی کۆمەڵگە.

لەلایەکی دیکەوە کۆنفرانسەکە لەچوار تەوەر پێکهاتبوو بەو شێوەیەی خوارەوە:

**تەوەری یەکەم:** بەتاکێکی تەندروست کۆمەڵگەیەکی تەندروست دەپارێزین.

**تەوەری دووەم:** ئارامی دەروونی لەنێوان خۆپاراستن و چارەسەرکردن.

**تەوەری سێیەم:** بەرزرکردنەوەی فێرکردن لەجیاتی خێرایی پێشکەوتن.

**تەوەری چوارەم:** هەوڵدان بۆ وردی پێوانەکردن لەفەراهەمکردنی دۆخێکی دروستی دەستنیشانکراو.

ئەوەی شیاوی باسە لە کۆنگرەیەدا توێژەرانی زۆرێک لەوڵاتە عەرەبییەکان بەشداریان کرد و ٨٥ توێژینەوە لە ماوەی دوو رۆژدا پێشکەش دەکرێ.





م.کاروان حەمە سەعید*

# کاریگەری گەشتووگوزار لەسەر ئابووری نیشتیمانی و لایەنی مرۆیی

**کەرتی گەشتووگوزار پشت بە زۆر سەرچاوە دەبەستێت، نوێگەریە و بەهاکەی بەرز دەبێت بە تێپەڕبوونی کات، مۆرکێکی مرۆی هەیە لەبەرهەمی خزمەتگوزاری گەشتیاری لە لایەنە ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی و ژینگەییەکان. بۆیە کەرتی گەشتیاری کاریگەری گەورەی دەبێت لەسەر سەرجەم کەرتەکانی ئابووری نیشتیمانی، سوودی راستەوخۆی دەبێت و ڕەنگ دەداتەوە لە پەیکەری ئابووری و پێکهاتەی کۆمەلایەتی و ژینگەیی. گەشتیاری بە شێوەیەکی گشتی و گەشتیاری ئاینی بە تایبەتی کاریگەری راستەوخۆ و نا راستەوخۆی دەبێت، جا چ لەسەر ئابووری نیشتیمان یان لەسەر لایەنی مرۆی.**

**کاریگەرییە راستەوخۆیکانی گەشتووگوزار**

**یەکەم - کاریگەری گەشتووگوزار لەسەر داهاتی نیشتیمانی**

بەرهەم یان داهاتی نیشتیمانی پێکدێت لەو چالاکییانەی کە کەرتەکانی تر ئەنجامی دەدەن (کشتووکاڵ، پیشەسازی، خزمەتگوزاری ) بە درێژای ساڵ هەر کەرتێک لە کۆمەڵە پرۆژەیەک پێک دێت، کە بریتیە لە کارگە و کێڵگەی کشتووکاڵی و دامەزراو و دەزگاکانی تر.

ئەو یەکانە هەڵدەستن بە تێکەڵ کردنی توخمەکانی بەرهەم هێنان لەگەڵ یەکتری تاکوو بکرێن بە شتوومەک و خزمەتگوزاری بۆ کۆمەڵگە.

گەشتیاری چالاکییەکانی ئەنجام دەدات لە ڕێگای یەکەکانی وەک، میوانخانە و چێشتخانە، هۆیەکانی گواستنەوە ..... هتد هەڵدەستن بەتێکەڵکردنی توخمەکانی بەرهەمهێنان وگۆڕینیان، بۆ کۆمەڵە خزمەتگوزاریەک کە دەفرۆشرێن بە گەشتیاران.

داهاتی گەشتیاری بریتیە لەوەی کە گەشتیار خەرجی دەکات، لەبەرانبەر ئەو خزمەتگوزاریانەی کاتی گەشت کردن بۆ ناوچە شوێنەوارییەکان و مێژوویەکان و شوێنی ئایینیە پیرۆزەکان، پێشکەشیان دەکرێت، کە بە داهاتی یەکە خزمەتگوزاریە کارکەرەکان دادەنرێت لە بواری گەشتیاری.

چەندین وڵات هەن گەشتیاری بە سەرچاوەیەکی سەرەکی داهاتی نیشتیمانی دادەنرێت، دەکرێت گەشتیاری لە عێراق رۆڵێکی گرنگی هەبێت لەداهاتی نیشتیمانی، چونکە شوێنی شوێنەواری و گەشتیاری و شاری ئاینی و شوێنی ئایانی دیکەی لێیە، کە توانای راکێشانی ملیۆنەها گەشتیار و میوانی ئاینی و موسڵمانان و هیتری هەیە لە ساڵێکدا.



**دووەم – کاریگەری گەشتوگوزار لەسەر  دراوەکان**

پرۆسەی میوانداری کردنی سەردانیکەرانی عێراق بە ئامانجی سەردانکردنی مەزارگە پیرۆزەکان، هۆکارە بۆ هاتنە ناوەوەی بڕێکی زۆر لە دراوی بیانی، بەمەش گەشتیاری سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ بەدەست هێنانی دراوە بیانییەکان کە پاڵپشتی بودجە خەرج کراوەکان دەکات، هەر لەم ڕووەوە دەبێت ڕەچاوی هاوسەنگی بکەین، لە نێوان داهاتی دراوە بیانییەکان، بە یارمەتی گەشتیارانی هاتوو بۆ گەشت کردن لە لایەک و ئەوەی کە خەرج دەکرێت لە دراوی بیانی لەسەر هاوردە کردنی پێداویستی کەل وپەلی بەکار هێنان لە لایەن دامەزراوە گەشتیارییەکان لە لایەکەی ترەوە.

دەرەنجامی جیاوازی نێوان داهات و خەرج، بڕیار لە ڕۆلی گەشتیاری لە تەرازووی دراوەکان دەدات، لە بارودۆخی سەرکەوتنی داهات، ئەوا زیادەبوون لە دراوەکان دەبێت، ڕۆلی ئەرێنی دەبێت، لە بارودۆخی، ئابووری خەرجی، ئەوە کورت هێنان دەبێت و ڕۆلی نەرێنی دەبێت

**سێیەم -کاریگەری گەشتووگوازار لە بودجەی حکومەت**

دەکرێت گەشتووگوزار ببێتە سەرچاوەیەکی دارایی گرنگ بۆ گەنجینە ولات، لە ڕێگەی داهاتەکانەوە، کە بە ڕسومات وەردەگیرێت لە گەشتیاران و سەردانیکەرانی لە بری ئەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەشیان دەکرێت.

بێ گومان ئەگەر گەشتیار یان میوان بڕوای وابوو کە ئەو پارەیەی خەرج دەکرێت بۆ مەبەستی پەرەپێدانی شوێنەوارەکان و شوێنە مێژووییەکان و مەزارگە و پێگە ئاینی و دامەزراوە خزمەتگوزارییەکانیان، باج و ڕوسماتەکان، کە دەسەپێندرێت لەسەر پرۆژە گەشتیارییەکان سەرچاوەیەکی گرنگی بودجەی ولاتە.

**چوارەم – کاریگەری گەشتوگوزار لە دابین کردنی هەلی کار**

پیشەسازی گەشتوگوزار سەر بە کەرتی خزمەتگوزارییە، واتە چالاکی گەشتیاری پشت بە دەست بازووی مرۆی دەبەستێت لە کار کردن، زەحمەتە ئامێر ببێتە شوێنگرەوەی دەستی کار، تەنیا لە سنورێکی کەم نەبێت وەکو بەکار هێنانی کۆمپیوتەر، ئەمەش زانای فەرەنسی (فۆرستی ) جەختی لەسەر کردۆتەوە لە بیردۆزەکەی کە بینادراوە، لەسەر کۆمەڵە ژمارە و ڕاستیەک کە وەرگیراوە لە ڕەوشی پەرەسەندووی کەرتی گەشتیاری ، ئەنجامەکەی بریتیە لەوەی هەرچەندە کەرتی گەشتیاری پەرەسەندوو بێت، ئەوەندە پشت بەستن بە ڕەگەزی کار زیاد دەبێت، واتە گەشتوگوزار توانای زۆری هەیە لە دۆزینەوەی هەلی کاری باش، لە چوار چێوەی سنوری کەرتی گەشتیاری



**پێنجەم-** کاریگەری گەشتوگوزار لە دووبارە دابەش کردنەوەی داهات و چالاک کردنی گەشەی جوگرافی زۆرجار پرۆژەی گەشەپێدان لە شارە گەورە و چڕەکان جێبەجێ دەکرێت، ئەمەش لەسەر حیسابی شارە بچووک و دێهاتەکان و ناوچە دوورە دەستەکان، لەوکاتەی دانیشتووانی شارەکان سەرجەم پێدوایستی ژیانی هاوچەرخیان هەیە، کەچی دانیشتووانی شارە و بچووکەکان و دێهاتەکان دەناڵێنن بەدەست کەم کوڕی لەو پێداویستیانە، ئەمە دەبێتە هۆکاری دابەش بوونی نا دادپەروەرانە لە گەشەی داهات.
بەڵام ئەمە لەسەر کەرتی گەشتیاری پەیڕەو ناکرێت، بۆ نموونە لە عێراق ناوچە شوێنەوارییەکان و مێژووی و مەزارگە ئاینیە پیرۆزەکان لە شارە گەورەکاندان، وەکو ( بەغداد و موسڵ و بەسرا و هەولێر و بابل و ناسریە و نەجەف و کەربەلا و کازمیە و سامەڕا و کوفە ) هەروەها لە شارە بچووک و دێهات و ناوچە دوورە دەستەکانیش هەن وەکو لە مەدائین (سەلمان پاک ) شارۆچکەکانی حەمزە و. قاسم و رەفاعی و عەلی رۆژاوا و عەلی رۆژهەلات و موسەیەب و سەید محەمەدو دۆر ... هتد
لێرەدا رۆلی گەشتیاری دێتە پێشەوە لە دابەشکردنی دادپەروەرانەی داهات و پرۆژەکانی گەشەپێدان لە سەرەجەم ناوچە دوور دەست و شارە بچووکەکان و گەورەکان، بە تایبەتی پرۆژەکانی رێگەوبان و. گواستنەوەی خزمەتگوزاری، وەکو بازاڕ و میوانخانە و چێشتخانە و پاشکۆ گەشتیاریەکان

**شەشەم - کاریگەری گەشتووگوزار لە بازاڕ کردنی هەندێک کەلوپەل**

توێژینەوە تازەکان دەریان خستووە کە گەشتیاران بڕێکی زۆری پارەیان خەرج دەکەن لە کەلوپەل لەو وڵاتانەی کە گەشتی بۆ دەکەن، تەنیا دیاریی و یادەوەری گەشتیاری نیە، بەڵکوو بۆ کڕینی بەربووم و کەلووپەلی گونجاوە، بە تایبەتی بەربوومی پیشەسازی کارە دەستیەکان.
ئەو خەرج کردنە لە لایەنی ناردنەوە بۆ بەرهەمی نیشتیمانیە، بێ ئەوەی پێویستی بە کارگە و بازاڕ کردن بێت، بەمەش ئەم ناردنە بە بێ ئاستەنگی پێشبڕکێیە لە بازرگانی نێودەوڵەتی، هەرچەند جولە گەشتیاری و گەشتیارە بە توانا داراییەکان زیاد بێت، ئەوەندە دەستکەوتی ناردنەکە لە ناوەوەی وڵات بۆ گەشتیاران و سەردانیکەران زیاد دەبێت.
پێویستە وڵات بایەخ بە پیشەسازی و کارە دەستیەکان بدات و پاڵپشتی تەواویان بکات، بۆ پەرە پێدانیان و بیرکردنەوە لە فراوان کردنی بازنەی بەرهەمە دەستیەکان و فۆلکلۆریەکان لە عێراق هاندانی کردنەوەی فیستیڤاڵەکان بۆ بە بازاڕ کردن لەسەرجەم شارەکانی عێراق
لە گەشتیاران بە ملیۆنان کەس ساڵانە، واتە بەدەست هێنانی پاڵپشتی دەیان ملیۆن لە نەوەکانی وڵاتە جیاوازەکان، ئەگەر هاتوو میواندارییەکی شارستانیانەیان بۆ بکرێت و شیاو بێت و رەزامەندیان بەدەست بێنێت و سەرجەم خزمەتگوزاریەکانیان پێشکەش بکرێت
کاریگەری تر لەسەر کەشتوگوزار هەیە و دەکرێت بایەخی هەبێت و توێژینەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت.

**کاریگەری گەشتوگوزار لە ئاستی گشتی نرخەکان**

لە وەرزەکانی گەشتوگوزار بە تایبەت زیارەتی ئاینی گرنگ، سەدان هەزار گەشتیار روو لە شارە عێڕاقیەکان دەکەن بە



تایبەتی شارە ئاینیە پیرۆزەکان، لە بەرانبەر ئەو ژمارە زۆرەی گەشتیاران بەرزبوونەوەی نرخ دەست پێ دەکات، بە تایبەت لەو بابەتانەی بەکار دەبرێن، بەمەش هەڵئاوسان ڕوو دەدات، ئەو هەڵئاوسانە کار دەکاتە سەر دانیشتووانی شار کە داهاتیان سنووردارە، لە شارە گەشتیارییەکان بە تایبەت لە شارە ئاینیەکان، کە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی بژێوی بۆیە دەبێت پەیڕەوی شێوازەکان بکرێت بۆ دابینکردنی کەلوپەلە بەکار بەرەکان بۆ دانیشتووانی ئەو شارانە، بە تایبەتی خاوەن داهاتی سنووردار، بە نرخی ئاسایی تاوەکو کار نەکاتە سەر ئاستی بژێویان.
یەکێک لە گرنگترین هۆکارەکانی کۆنترۆلی نرخەکان، زیاد کردنی خستنە ڕووی کەلوپەل و خزمەتگوزاریەکانە، کە داواکاری لەسەر زیاد دەبێت، لە وەرزەکانی گەشتوگوزار و بۆنە ئاینیەکان.

**کاریگەری گەشتوگوزار لە کێشە ئابوورییەکان**

بریتیە لەوەی کە کار کردنی شوێنە گەشتو گوزارییەکان لە بنەڕەتدا لەسەر گەشتیاران و سەردانیکەران وەستاوە، کە لە وڵاتێکی دیاریکراوەوە دێن، بەمەش چالاکی ئابووری لە شارەکان کاریگەری نەرێنی و ئەرێنی دەبێت لە ئابووری ئەم وڵاتە، گەشتووگوزار دەبوژێتەوە بە شێوەیەکی گشتی و گەشتوگوزاری ئاینی بە تایبەتی، کاتێک ئەم ولاتە لە بارودۆخی باشی ئابووری بێت، پێچەوانەشی ڕاستە، یان لەوانەیە بارودۆخی نا ئاسایی روبدات، وا بکات گەشتیاران و سەردانیکەران نەتوانن بێن بۆ گەشتوگوزار، ئەمەش دەبێتە هۆی پشێویەکی تەواو لە چالاکیە ئابووریەکان، لە شارە عێراقیەکان ئەوەی پێویستە هەمەجۆر کردنی سەرچاوەی داواکاریە لەسەر گەشتوگوزار لەو وڵاتە، پشت نەبەستن بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر یەک وڵات، بەڵکوو دەبێت بانگەشەی گەشتووگوزاری بۆ سەرجەم وڵاتە ئیسلامیەکان بکرێت.

**- کاریگەری کۆمەڵاتی و رۆشنبیری لە گەشتوگوزاردا**

لە ئەنجامی تێکەڵاوی راستەوخۆ لە نێوان دانیشتووانی ناوخۆی لە لایەک و گەشتیاران و سەردانیکەرانی شارە عێراقیەکان لە وڵاتە جیاجیاکانەوە، کە رۆشنبیری هەمە چەشنەن لە لایەکی ترەوە، بەمەش دانیشتووانی ناوخۆی چەند داب و نەریت و هەڵس وکەوتی کۆمەڵایەتی بەدەست دەهێنن لە ئاستە جیاوازەکان، ئەمەش کاریگەری ئەرێنی یان نەرێنی دەبێت لەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتی وڵات، بەواتەیەکی تر ئەو بەریەککەوتنە گۆرانکاری دروست دەکات، لە ژینگەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری، سەدەکانی ڕابردوو سەلماندوویانە کە تێکەڵاوی دانیشتووانی شارە ئاینییەکان لەگەڵ هاتووان بۆ سەردانیکردنی مەزارگە پیرۆزەکان بۆتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری دانیشتووان، ئەمەش رەنگدانەوەی هەبووە لەسەر پێکهاتەی دانیشووان، کە لێبوردە بن لە شارە ئاینییەکان، هەروەها بۆتە سەرچاوەیەک بۆ زۆربەی جوڵە هزری و سیاسیەکان وەرگێران و توێژینەوەی زمانەکان و رۆشنبیریەکان و نەریتەکان

*** مامۆستا لەکۆلیژی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەکان**



**سمکۆ عەبدولکەریم**

# ناسینەوەی ڕۆشنبیر

ئەگەر مەسەلەکە بەو شێوەیە بێت هەموو ئەرکەکان کەوتبنە سەر شانی ڕۆشنبیر و ئەو لە وردو درشتی مەسەلەکان بەرپرس بێت، دەبێت ئەو پێناسەیە ڕاست بێت « کە مرۆڤ هەر هەموویان ڕۆشنبیرن» چونکە مومکین نییە بونیات نان و گەشە پێدانی هەموو ئەو بونیاد نراوانەش تەنیا لە ئەستۆی توێژێکی دیاریکراودا بێت، بەبێ ئەوەی لە ماناو ئاماژەکانی و ئەرک و ئازادی بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی مەعریفەی ڕۆشنبیر تێگەیشت بین، لە کاتێکدا بە پێی بنەما سروشتییەکانی مرۆڤ، مرۆڤ ئازادە لەوەی بە چ ڕێگایەکدا دەڕوات، چونکە دواتر ئەوە ڕێگاکەیە بەهای ئەو مرۆڤە دەخەملێنێ، ڕەوتی مێژووش پڕە لەو جۆرە مرۆڤانە، لاپەڕەکانی مێژووش پڕە لەو جۆرە خەملاندنانە، ئەوە نەک تەنیا، تا لە ژیاندا ماوە، ڕەنگە بە دەست بێ مۆڕاڵی خۆی بناڵێنێ، بەڵکو دوای مردنیشیان، چاوەڕوانکراوە نەوەکان لێپرسینەوەیان لە گەڵدا بکەن، دوور نییە لە گۆڕەکانیشیان دەربێنن.

«میرابۆ» نووسەرو ڕۆژنامەنووس و شۆڕشگێر و خەتیبی شۆڕشی فەرەنسا، دوای مردنی وەک ڕێزلێنان لێی لە گۆرستانی گەورە پیاوانی فەڕەنسا نێژرا، بەڵام دواتر دوای ڕوخانی پاشایەتی، خەڵکی فەڕەنسا دەستیان بە نهێنییەکان گەیشت و بەڵگە نهێنییەکانی پاشایان خوێندەوە، دەرکەوت کە «لویسی شازدە» توانیویەتی لە ژێرەوە «میرابۆ» بکڕێت، دوای دەرکەوتنی ئەم نهێنیانە، بە دەیان هەزار لە خەڵکی پاریس ڕوویان کردە گۆڕستانی «پانتیۆن» و بە ڕقێکی زۆرەوە گۆڕەکەیان هەڵتەکاند و پاشماوەی لاشەی میرابۆیان هەر لەوێ سوتاند.

نمونەی لە شێوەی « نیکۆس کازانتزاکی» ئەدیبی گەورەی یونان-یشمان هەیە کە بە هۆی بیروباوەڕەکەیەوە کەنیسە نەیهێشت لە دوای مردنی لە گۆڕستاندا بنێژرێ.

لەم چوارچێوەیەدا دەکرێ بڵێن موسەقەف ئەو کەسەیە کە لە دەرەوەی پێگەی سروشتی خۆی، خۆی لە هەندێ مەسەلە هەڵدەقورتێنێ، کە پەیوەندی بەوەوە نییە» هەرچەندە ئەم تێزە زیاتر لەسەر ئەو ڕۆشنبیرانە جێبەجێدەبێت، کە پەیڕەوی کارە ڕۆشنبیریەکان دەکەن.

فەرەنسا خاوەنی چەندین جولانەوەی ڕۆشنبیری زیندووە کە دەکرێ وەک نموونە بۆ تێگشتن و ناسینەوەی ڕۆشنبیر

سوودی لێوەربگرین.
«پییر بۆردیۆ» بیرمەند و کۆمەڵناسی فەرەنسی دوای « ئەمیل زۆلا» بە دیارترین کەسایەتی سەقافی فەرەنسی دادەنرێ کە دوای زیاتر لە یەک سەدە لە ساڵی١٩٩٥ بووە داینەمۆ، جارێکی دیکە ئەو گومە مەنگەی شەڵەقاند کە خەریک بوو بۆگەنی دەکرد. ئەمەش لە کاتێکدا بەر لە چارەکە سەدەیەک بەر لەو مێژووە (بێدەنگی و دوورەپەرێزی هەڵبژاردبوو، بە شێوەیەک دژی هەر هەوڵێک دەوەستایەوە کە دەیانویست پەلکێشی دەرەوەی کایەکانی زانسی و ئەکادیمی بکەن، تا ئەو رادەیەی رەخنەی لە هەموو ئەوانەش دەگرت کە تێکەڵی جموجۆڵی سیاسی دەبوون، لەسەرووی هەمووشیانەوە «میشێل فۆکۆی» هاوەڵی).

ساڵی ١٩٦٨ لەم بارەیەوە وتارێکی بە ناونیشانی» پیشەی سۆسیۆلۆژ» نووسی:
(لەسەر سۆسیۆلۆژ پێویستە بەرەنگاری ئەو پێغەمبەری ناخی بێتەوە کە خەڵکی داوای لێ دەکەن دابەزێتە سەر شەقامەکان و تێکەڵ بە کێشەکانیان بێت و لە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیان بەشداری بکات).
کەچی دوای یەک چارەکە سەدە هەر خۆی باوەڕی بەمە نامێنێ و تەواو پێچەوانەی ئەمە رفتار دەکات، ساڵی ١٩٩٥ دەچێتە سەر شەقام و پشتیوانی لە هەڵوێستی مانگرتوان دەکات، ئەمەش وا دەکات ببێتە سیمای رۆشنبیری سەر شەقامەکانی فەرەنسا لەو سەردەمەدا.
دیارە ناکرێ بەهۆی ئینتماکەیەوە، یان هەر ڕێبازێکی فکری ناونیشانی ڕۆشنبیر لە هیچ ڕۆشنبیرێک وەربگیرێتەوە، چونکە مومکین نییە ئەو جولانەوە سەقافییەی لەوڵاتێک، لەناوچەیەک، لە شارێک هەیە بە هەمان ئەندازەو تێگەیشتن لە شوێنی دیکەش هەبێت، ئەوەی ساڵی ١٨٩٤ لە پاریس-ی پایتەختی فەرەنسا روویدا، لە هیچ وڵاتێکی تری دونیا، نە روویداوە، نە مەرجە رووبدات، کاتێک لە بەرامبەر کێشەی حوکمدانی ئەفسەرێکی فەرەنسی بە ڕەگەز جوولەکەدا، بە تۆمەتی سیخوریکردن بۆ بەرژەوەندی ئەلمانیا، جووڵانەوەیەکی گەورەی رۆشنبیران سەری هەڵدا، کە ناسراوە بە کێشەی « دریفۆس»
بۆ یەکەم جار رۆشنبیران بەیاننامەیەکیا بڵاوکردەوە، بە ناوی « بەیانی رۆشنبیران» ئەمەش لە پەراوێزی ئەو وتارەی «ئەمیل زۆلا» کە وەک بەرگریکردنێک لەو ئەفسەرە نووسی بووی، ئەمە یەکێکە لەو رووداوە گەورانەی دونیا کە نووسەرێک تەنیا بە وتارێک رای گشتی فەرەنسای دابەشی سەر دوو بەرەی جیاواز کرد، بەرەی پشتیوانیکردن لە دریفوس و بەرەی پشتیوانیکردن لە دەسەڵات، کە لەم کێشەیەدا رۆشنبیران لە بەرەی دژ بە دەسەڵاتدا بوون و پشتیوانیان لە «دریفۆس» کرد کە ئەو تۆمەتانەی دراونەتە پاڵی بێ بنەمان، دواتر بەرەی رۆشنبیرانی دژ بە دەسەڵات سەرکەوتن و بێتاوانی «ئەلفرید دریفۆس» سەلمێنرا، ئەم هەڵویست و رووداوەی رۆشنبیران لە پاریس بە بنەچەی تێگەیشتنی رۆشنبیری دادەنرێ لە جیهاندا، لەبەرامبەریشدا بە رووداوێکی شەرمەزارانە دادەنرێت لە مێژووی فەرەنسادا.
هەر لەم روانگەیەوە، ڕۆشنبیر دەبێتە خاوەنی ئەو ناسنامەیەی کە خۆی هەڵیبژاردوە، چ وەک ڕۆشنبیرێکی سەر بە دەسەڵات، یان دژە دەسەڵات.
ئەمەش بە پێی شوێن و کات و باردۆخی شوێنەکە، کە وادەکات رۆڵی ڕۆشنبیر، لەو نێوەدا ون، یان تێکەڵ بکرێت، بەومانایەی رۆڵی ڕۆشنبیر هەڵوێست وەرگرتنە لە رووداوە سیاسییەکان، یان بێدەنگ بوونە لە بەرامبەر هەموو ئەو رووداوانەی کە روودەدەن، یان وەزیفەیەکی ترە لە پاڵ ئەوانەدا، کە بریتییە لە گۆڕانکاری، لە چوارچێوەی پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابوری، کە ئەمەش تەنیا لە ئەستۆی ڕۆشنبیردا نییە، بەڵکو پرۆسەی گۆڕان پرۆسەیەکە هەنگاو بە هەنگاو دەچێتە پێش، ئەمەش لە کاتێکدا «سەرەتا دیموکراتییەت لە ئەقلی تاکەکاکاندا چەکرە دەکات و ئاشتیش لە گوێچکەکانی خەڵکیدا دروست دەبێت و کرداریش بە کردەوە لە گیانی هاوڵاتیاندا سەرچاوە دەگرێت»
لەم گۆشە نیگایەوە گۆڕانکاری بەکردەوە لە کۆمەڵگادا، لە گۆڕانی سیستم و تێگەیشتن و بیرو بەهاکان، دەست پێدەکات، کە جگە لە دەسەڵات وەک لایەنی بڕیار بەدەست و هاوڵاتیان وەک باوەڕهێنان بە گۆڕانکارییەکان و بە پێویست زانینی.
رۆڵی ڕۆشنبیر دەست پێدەکات لە کاریگەری دانان لەسەر، هەم دەسەڵات و هەم هاوڵاتیان بۆ رازیی بوونیان بە گۆڕانکارییەکان، وەک بنەمایەکی گرنگ و پڕبایەخی پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی. هەروەک بیرمەندی گەورەی ئیتالی» گرامشی» دەڵێ: دوو جۆر موسەقەف هەن «موسەقەفی ئۆرگانی و موسەقەفی تەقلیدی» ئۆرگانی بەومانایەی، کە هەڵگری پرۆژەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتییە و کار بۆ سەرخستنی دەکات، تەقلیدیش ئەوەیانە کە هەموو سەقافەتەکەی دەخاتە خزمەتی بەردەوام بوونی هەیمەنەی ئەو گرووپە مێژووییە باوەی کە هەیە».



## پ.ی.د. سازان قادر مەولود:

# ڤایرۆسی کۆرۆنا دوژمنێکی ئەوەند سەرسەخت نییە، کە نەتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین

**لە ماوەی بلاوبوونەوەی نەخۆشی کۆفید ١٩، زانکۆ پرێس سەردانی پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر سازان قادر مولود - مامۆستا لە بەشی بایۆلۆژی زانکۆی سەلاحەدین و پسپۆری ڤایرۆسات و ئەندامی سەنتەری توێژینەوە زانکۆی سەلاحەدین و ئەندام لە لیژنەی بەرەنگاربوونەوەی فایرۆسی کورۆنا لە زانکۆی سەلاحەدین کرد. بەرێزیان بەم شێوەیە باسیان لە ڤایرۆسی کورۆنا کرد:**

*** بەشێوەیەکی گشتی ڤایرۆس چییە؟**

- بەشێوەیەکی گشتی ڤایرۆس پیکهاتوویەکی نازیندووە کە بەچاو نابینریت ئەو کاتە دەبیت بە زیندوو کە دەچێتە نێو خانەیەکی تەندروست کە بۆ دابەشبوون وزیادبوونی پێویستی بە ناوەندێکی زیندوو هەیە.

*** ڤایرۆسی کورۆنا سارس-٢ چییە؟**

- جۆریکە لە خیزانی کۆرۆنا ڤایرۆس کە بۆماوە مادەی لە تاک شریتی ناووکە ترشی رایبۆزی پۆزەتیف پێکهاتووە و دەور دراوە بە پێکهاتەیەکی پرۆتینی و دواتریش بە پەردەیەکی پێکهاتە چەوری،کە سێ جۆر لە درکە پرۆتین هەلدەگرێ ئەوانیش E, M, S کەهەریەکەیان فرمانی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئەم خیزانە لە چەند جۆر ڤایرۆس پێکهاتووە کە تووشی ئاژەڵ و بالندەکان دەبن کە زۆرجار دەگوازریتەوە بۆ مرۆڤ و دەبێتە هۆی دروست بوون و بڵاوبوونەوەی پەتایەکی کوشندە کە تووشی ریرەوەکانی کۆئەندامی هەناسە و سییەکان دەبێت نموونەش دووان لە جۆرەکانی میرس وسارس١ کە لە سالانی پێشتر لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و چین و یابان بڵاوبووە. ئەوەی کە ئیستا بووتە پەتایەکی جیهانگیر و زۆربەی وولاتانی گرتۆتەوە پێ دەلین ڤایرۆسی کۆڕۆنا سارس-٢ یان نوێ کە بە پەتای کۆفید ١٩ ناسراوە توێژینەوەکان ئاماژە بەوە کردووە کە بۆماوە مادەکەی نزیکەی ٨٠٪ -٨٨٪ لیکچووە لەگەڵ سارس-١ هەرچەندە وەک ئەو کوشندە نیە بەلام زووتر بلاودەبیتەوە.

*** نیشانەکانی تووشبوون بە کۆفید ١٩ چین؟**

- دەرکەوتنی نیشانەکانی تووشبوون بەم ڤایرۆسە کاتی پیدەچیت کە ٣-١٤ رۆژ، زۆرجار زیاتر دەخایەنیت و سەرەتاترین نیشانەکانی وەک هەلامەتیکی وەرزی ئاسایی دەردەکەویت کە بریتیە لە بەرزبونەوەی پلەی گەرمی لەش

و دروستبونی ئاوی لوت و هەوکردنی و پژمین زۆر دوای چەند نیشانەیەکی توند کە ئەوانیش کۆکینی بە ئازار و وشک، گرزبوون و و ئازاری ماسولکەکان و تەنگەنەفسی و ئازاری سینگ.

*** کێن ئەوانەی کە زووتر تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبن؟**

- لە هەموو رەگەز و تەمەنیک دەگریتەوە بەلام لە بەساڵاچووان و ئەوانەی نەخۆشیە دریژخایەنەکانی وەک نەخۆشی دڵ و فشاری خوین و شەکرە و نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسە و گورچیلەیان هەیە لەگەڵ ئەوانەی چارەسەری نەخۆشی شیرپەنجە وەردەگرن.

*** چۆن ئەم ڤایرۆسە بلاودەبیتەوە؟**

- ڤایرۆسی کورۆنا بەئاسانی بە بەخیرایەکی زۆر لەنیوان مرۆڤەکان دەگوزاریتەوە لەریگەی دلۆپەکانی پژمین و کۆکین و بەرکەوتنی کەسی هەلگر و تووشبوو بە ڤایرۆسەکە

*** چۆن خۆمان لە ڤایرۆسی کورۆنا بپاریزین؟**

- بەبۆچوونی خۆم و پشت بەستن بە میژوو و هەموو ئەو تویژینەوانەی کە پیشتر و ئیستاش هەن ئەم ڤایرۆسە دوژمنێکی هینده سەرسەخت نییە، کە نەتوانین زاڵ بین و بەرگری لە خۆمان بکەین . سەرەکیترین و باشترین ریگای خۆپاراستنە لە ئیستادا ئەویش بە مانەوەمان لە ماڵ و خۆبەدوورگرتن لە قەرەباڵخی و پابەندبوون بە رینمایەکانی لایەنی پەیوەندیدار وەک پسپۆران و پزیشک و وزارەتی تەندروستی. پێویستە هەرتاکیک لەیەک کاتدا هەم ببیت بە پزیشک و پاریزەر بۆ خۆی و خۆشەویستانی. نامەویت ئەوە لەبیربکەم راگرتن و بەهیزکردنی بەرگری لەش زۆر گرینگە بە هیلی سەرەکی بەرەنگاربوونەوەی لەش دادەنریت بەرامبەر ئەم ڤایرۆسە بۆیە خواردنی خواردەمەنی تەندروست و میوەی دەوڵەمەند بە ڤیتامین سی و ئەوانی تر و نووستنی تەندروست و لەکاتی خۆی پیویستە. لەلایەکی دیکەوە راگرتنی پاکوخاوینی و دەست شووشتنی بەردەوامی دەستەکان رەچاو بکەین بەتایبەت بە ئاوی گەرم سەرووی ٢٠ پلەی سەدی، چونکە ئەم ڤایرۆسە حەز بە گەرمی ناکات.

*** کورۆنا ڤایرۆس هیچ ڤاکسینی هەیە**

- هەولەکان بەردەوامن لەلایەن چەند وولاتیک و بە شیوازی جیاواز بەلام تا ئیستا هیچ ڤاکسینیک نییە کە بەشیوەی فەرمی و کۆتایی رەزامەندی گشت لایەنە ریکخراوە تەندروستیە نیودەوڵەتیەکانی وەرگرتبیت ئەوەش لەبیر نەکەین پەرەپیدان و کاری دروست کردنی ڤاکسین کات و تیچوی زۆری دەویت.

*** بۆچی دەلین لەگەڵ گەرما ئەم ڤایرۆسە نامینیت؟**

- بەبۆچوونی خۆم و پشت بەستن بەو تویژینەوانەی کە هەن کۆمەلیک هۆکار وا دەکات بلین کیرفی بلاوبوونەوەو تووشبون بەم پەتایە بەبەرزبوونەوەی پلەی گەرمی دادەبەزیت بەتایبەت لەو ناوچانەی کە گەرم و ووشکن ئەوانیش پیکهاتە چەوریە بەرگی دەرەوەی فایرۆسەکە کە هەلگری درکە پرۆتینەکانن بەرگەی پلەی گەرمی سەرووی ٣٠ پلەی سەدی ناگرن بەمەش توانای بلاوبوونەوە کەم دەکات لەگەڵ ئەمەش گۆرانکاری بەسەر ستایلی ژیانی رۆژانەی خەلک دیت وەک زیاتر خۆدانە بەرخۆر و هەواگۆرکێ ناو ماڵ و ژوورەکان بەکردنەوە دەرگا و پەنجەرەکان و کەمتر کۆبوونەوەو و بەریەکەوتنی ئەندامانی خیزان لە یەک شوین و سەرووی هەمووان ئەو ریکارە خۆپاریزی خۆمان و بە کەرەنتینکردنی کەسی هەلگر و توشبوو بە فایرۆس هەمووی دەبنە هۆکار.



# پلازمای خوێن بۆ نەخۆشانی کۆرۆنای نوێ

جیهان لە پێشبرکێیەکی خێرایە بۆ دۆزینەوەی پێکوتە (ڤاکسین) و چارەسەری نەخۆشی کۆڤید-١٩ ئەوەی ئاشکرایە ودەزانرێت ئەوەیە کە لە ماوەیەکی کورتدا نە پێکوتە و نە چارەسەری نادۆزرێتەوە و ئەمە جگە لە کێشەکانی بەرهەم هێنان و بە کۆگا کردن و گواستنەوە و ئامادەبوونی بۆ هەموو خەڵکی جیهان کە نزیکەی ٧,٨ ملیار کەسە.

بۆ ئەم مەبەستە زانا ودکتۆرەکان لە جیهان دەبێ بیر لە چارەسەری خێرا بکەنەوە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی نەخۆشە ناجێگیر و ئاستەمەترسیدارەکان. لە دوو مانگی ڕابردوو چەندین وولات تەکنیکی بەکارهێنانی پلازمای خوێنی کەسانی چاکبوو لە نەخۆشەکە بۆ نەخۆشە ناجێگیرەکان تاقیکردۆتەوە.

**جارێ پێش ئەوەی بزانین ئایا ئەمە کار دەکات یان نا با تێبگەین پلازمای خوێن چیە؟**

خوێن کە شلەیەکی سوورە لە لەشی مرۆڤدا لە بنەڕەتدا لە دوو بەش پێکدێت بەشێکی خانەکانی خوێنن، بەشەکەی تریشی لە ئاو و پرۆتینە تواوەکان پێک دێت.. کاتێک بە تەکنیکی تاقیگەیی جیا دەکرێنەوە خانەکان دەنیشن و بەشە شلەکەی لە ئاوو و پرۆتینەکە سەرئاودەکەون و ڕەنگێکی زەردی هەیە (سەیری وێنەکە بکە).. یەکێک لەو پرۆتینانەی لە ناوپلازمای خوێن هەیە بریتیە لە پرۆتینێک کە پێی دەووترێت دژە تەن . دژەتەن لەشی مرۆڤ دروستی دەکات بۆ دژایەتی کردن و ڕێگری کردن لە میکرۆب و هەر شێیکی نامۆ کە دێتە ناو لەش. ئەم دژایەتی کردنە لە ڕێگای دروست کردنی دژە تەنەوە تایبەتمەندە و لە دوای ماوەیەک بۆ هەر میکرۆب و ڤایرۆسێک دژە تەنێکی تایبەتی دروست دەبێت کە بە ووردی بۆی دروست کراوە و لەهەر شوێنێک بیبینێت پێیەوە دەنووسێت.

**دژەتەن بۆ ڤایرۆسی کۆرۆنا هەیە؟**

بۆ ڤایرۆسی کۆرۆنا وەکو هەر میکرۆب و شتە نامۆکانی تر کاتێک دێتە ناو لەشی مرۆڤ وکێشە دروست دەکات، دژە تەن لە دژی ئەو ڤایرۆسە بە تایبەتمەندێتیەکی تەواو دروست دەکرێت لە ناولەش.. هەر کاتێک ڤایرۆسەکە لە خانەکان هاتە دەرەوە دژە تەنەکان پێوەی دەنووسێن ونایەڵن خانەی تر داگیر بکات و ژمارەکەیان زۆرتر بێت.. ئەمە بۆ کەسێکی ئاسایی و خاوەن بەرگری بەهێز کارێکی ئاسانە و ڕەنگە کۆرۆنا پێی نەوەستێ و چاک بێتەوە، بەلام بۆ ئەو کەسانەی بەرگری لەشیان لاوازە یاخود نەخۆشی تری درێژخایەنیان هەیە و لەش سەرقاڵی ئەو نەخۆشیانەیە یان هەر هۆکارێکی تر بۆ نمونە جگەرەکێشان یان نەرگەلە کێشان، لەو کاتەدا ڤایرۆسی کۆرۆنا هەل دەقۆزێتەوە و بەسەر بەرگری و دژە تەنە کەمەکان زاڵ دەبێت و خانەی زیاتر لە سیەکان داگیر دەکا و دایدەروشێنێ بەمەش نەخۆشەکە بۆ بارێکی ناجێگیر دەبات..



*پ.ی.د کارزان شێخ موحسین




**چۆن پلازمای کەسی چاکبوو کار دەکات لە نەخۆشی تر؟**

کاتێک کەسێک چاک دەبێتەوە لە نەخۆشی کۆرۆنا پلازمای خوێنی ئەو نەخۆشە ئەو دژە تەنانەی تێدا ماوەتەوە و بۆ ماوەیەکی نادیاری درێژ دەمێنێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە کە پلازمای کەسی چاکبوو دەدرێتە نەخۆشێک ئەوا ئەو دژە تەنانەی لە پلازماکە هەیە کار دەکەن بۆ لەناو بردن و تێکشکانی میکرۆب و ڤایرۆسەکان..

لە سالی ١٨٩٠ بۆ یەکەم جار دژی نەخۆشی کۆکەڕەشە بەکارهاتووە و دواتریش لە سالی ١٩١٨ بۆ پەتای ئەنفلۆنزای ئیسپانی بەکارهاتووە، هەروەها بۆ ئیبۆلا و جۆرەکانی تری کۆرۆنا بەکارهاتووە بەم دواییانە.

بۆ ڤایرۆسی کۆرۆنای نوێش بە هەمان شێوە پلازمای کەسی چاکبوو کە پڕیەتی لە دژەتەن بۆ ڤایرۆسەکە کاتێک دەدرێتە نەخۆش ئەوا دژەتەنەکانی ناو پلازماکە کە تایبەتن بە ڤایرۆسی کۆرۆنا، ڤایرۆسەکە دەگرن و نایەڵن چیتر خانە داگیربکات و تێکی بشکێنێت و زیاد بکات، بەمەش یارمەتی لەش دەدات بۆ لە ناوبردنی خانە تووشبووەکانی تر و چاکبوونەوە..

**کێ دەبێت پلازما ببەخشێت و چۆن؟**

هەرکەسێک کە تووشی ڤایرۆسەکە بووە و چاکبۆتەوە و پاش ماوەی ١٤ رۆژ دوای چاکبوونەوە دەتوانێت پلازما ببەخشێت بۆ نەخۆشی تر .. گرنگە کە هەموو ئەوانەی کۆرۆنایان گرتووە و چاکبوونەتەوە ئەو هەنگاوە بنێن بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی دیکە..

کارێکی ئاسانە ئەوەی لەسەر ئەو کەسەیە تەنها بتڵێک یان زیاتر خوێن ببەخشێت ، دواتر پلازمای لێ جیادەکرێتەوە،، بەلام گرنگە بانکەکانی خوێن بە وریایی و زانستیانە مامەڵەی لەگەڵ بکەن و دوو تێستی گرنگ ئەنجام بدەن ئەویش نەبوونی هیچ ژەهر و ماددەیەکی زیانبەخش و نەخۆشی تر و هەروەها تێستی دژە تەن بکرێت بۆ ئەوەی دڵنیابن کە بڕی






دژە تەنی پێویست هەیە لە ناو پلازماکە بۆ کۆرۆنا..

**ئەمە چارەسەرە و تەواو؟**

نەخێر، تا ئێستابە شێوەیەکی زانستی تەواو نەسەلمێندراوە کە پلازمای خوێن چارەسەرە.. توێژینەوەیەکی چین کە هێشتا پێداچوونەوەی زانستی هاوەڵانەی بۆ نەکراوە باس لەوە دەکا کە ٧ نەخۆش لە کۆی ١٠ نەخۆش بەشێوازێکی بەرچاو سوودیان لەم پرۆسەیە وەرگرتووە.. پێش بڕیاردان چەند فاکتەرێک کاریگەری زۆری هەیە لەسەر بەکارهێنانی پلازما.

**١- بۆ کێ بەکاردێت:**

پلازمای کەسی چاکبوو دەکرێ بۆ ئەو کەسانە بەکاربێن کە حاڵەتەکەیان ناجێگیرە بەلام شڵەژاو critical نیە،، چونکە بۆ نەخۆشێکی زۆر خراپ رەنگە تازە فریای نەکەوێت.. نەخۆشە ناجێگیرەکان و ئەوانەی نیشانەیان هەیە دەکرێ سوودی لێ ببینن بەمەش خواستی هەناسەدانی دەستکرد و چاودێری چڕ کەم دەبێتەوە..

بۆ ستافی نەخۆشخانەکان دەکرێ بەکاربێت، چونکە زۆر بەرکەوتەی ڤایرۆسەکە دەکەن و پێویستیان بە دژە تەن دەبێت..

**٢- کات:**

کات کاریگەریەکی زۆری هەیە لە بەکارهێنانی پلازمای خوێن چونکە چەند زووتر دوای دروست بوونی نیشانەکان بەکاربێت باشترە بەوەی کە ژمارەی ڤایرۆسەکە و توندی نەخۆشیەکە ماوەی ئەوەی ماوە کە کۆنترۆل بکرێت، بۆ نەخۆشێک کە کەوتە شڵەژان و هەناسەی دەستکرد رەنگە ئەو کاریگەریەی نەبێت..

٣- دەرمانی بەکارهاتوو:

لەبەرئەوەی تا ئێستا بە ڕوونی دیار نیە کام دەرمان کاریگەری زیاتری هەیە لەسەر ڤایرۆسەکە لە جیهان و بە جیاوازی شوێنەکان چەندین دەرمان تاقی دەکرێنەوە بەم



پێیەش چاکبوونەوەی نەخۆش دوای پێدانی پلازما ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ جۆری دەرمانەکە و کاریگەری دەرمانەکە بە تەنیا یان بە هاوبەشی لەگەل پلازماکە

**٤- ژمارە و ڕێژەی پلازمای بەخشەرەکان:**

ژمارەی ئەو کەسانەی چاکبوونەتەوە و ئامادەن خوێن ببەخشن هۆکارێکی کاریگەرە بۆ بەکارهێنانی پلازما، گرنگە زۆرترین کەس پلازما ببەخشێت بۆ ئەوەی باشترین پلازمای پڕ لە دژەتەن بەکاربێت بۆ نەخۆشەکان.. هەموو پلازمایەک کاندید نیە بۆ بەکارهێنان تا لەو تاقیکردنەوانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا دەرنەچێت..

**لە کوردستان چی دەکرێت و چی بکرێت باشە؟**

ئەوەی تا ئێستا لە کوردستان دەکرێت هەوڵی تاک تاکەییە و بە شێوازێکی زانستی و بە دیراسەتێکی کلینیکی نەکراوە.. بە پشت بەستن بە زانیاریەکانی وولاتان و بۆ ئەو نەخۆشانەی کە لە نزیکە مەرگن پلازما بەکارهاتووە و کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبووە..

بۆیە زۆر گرنگە دووبارە زۆر زۆر گرنگە کە وەزارەتی تەندروستی بە پاڵپشتی زانایەکانی مایکرۆبایۆلۆجیا و بەرگری زانی و فسیۆلۆجی زان و خوێنزان و ئامارزانەکانی خوێندنی باڵا هەڵمەتێکی دەست بەجێ ڕابگەیەنن بۆ کۆکردنەوەی پلازما و تاقیکردنەوە و لێکدانەوەی دەرهاوێشتەکان بۆ زانست وخەلک و جیهان بخاتە ڕوو.. بەکارهێنانی بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و بێ پشت بەستن بە لێکدانەوەی زانستی و ڕای زانایان و کۆنسێنتی نەخۆشەکان ڕەنگە سوود و ئاکامی چاوەڕوانکراوی لێ نەکەوێتەوە.

**بەڕێوەبەری گشتی سەنتەری توێژینەوە لە زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر**

**سەرۆکی لێژنەی بەرەنگاربوونەوەی کۆرۆنا لە زانکۆ**

